- ناوی کتێب: هەورامان باشتر بناسین.
- نووسینی: موحەممەد رەشیدی ئەمینی.
- سەرپەرشتی هونەری و بەرگ: بەدرخان بەکر.
- هەڵەگری: شێرزاد فەقێ.
- بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی (٧٦).
- تیراژ: ٥٠٠ دانە.
- ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١١٥) ساڵی (٢٠١٠)ی دراوەتێ.

## هەورامان باشتر بناسین

هـەورامان و ناوچـەکانی دەوروبـەری بـەهۆی ئـەوەی لـەنێو جەرگـەی زنجـیرە کێوەکانی زاگرۆســـی باکووریدا ئۆقـــرەیان گرتـووە، بـە ناوچـــەیەکی کوێـستانی و ئەستەم دێنــە ئەژمارەوە، هـــەر ئەم تایبەتمەندیە وای لێ کـردوە کەســێ نـەتوانێ بە تەواوی دیمـەنی راستەقینەی بەشێوەیەکی زانستییانە بناسێت و بیناسـێنێت، بـۆ ناساندنی ناوچەیەکی ئاواش سەخڵەت لەم رۆژەدا هـەرمانێکی هـەروا هاسـان نییـە و پێویستی بـــە کەرەسەگەلێکی زانستی و کەسانی جۆگرافیا (ژئولوژی) ناسی کارئـامۆ هەیە، بەداخەوە تا ئەمرۆ ئێمە لەوەش بـێ بـەرین و لـەو رووەی وەکـو پێویـست بـێ هەنگاوی بۆ هەڵنەگیراوە.

دیارە ئەوەش شتێکی راست و جێگای باوەڕە کـە ئـەبێ هــەرکەســێ بـە گـوێرەی تواناو زانیاری خۆی دەوروبەری ژینگەی بـەجوانی بناسـێت و بزانێـت لـە چ خـاڵێکی ئەم گـۆی زەویـنـــەدا لەنگەری گرتـووە، ناسـینی ناوچـەیـــەکی ئـاواو کۆکردنـەوەی زانیـاری لـە روویـەکی زانـستییانەوە پێویـستی بەلێتۆژینـەوەو راڤـەکاری زۆرە، کـە ئـەوەش هـــاوڕابێ لەگـەڵ تێگەیـشتن لـە چـۆنیەتی ئـەکۆلوژی و مەعریفـەی ئـەو ناوچەیە.

منـیش بـەش بەحـــاڵی خـۆم بەکـەڵك وەرگـرتن لـە زانیـاری و دیدوبۆچـوونی نووسەران و شاعیران و توێژەران و کەسانی شارەزا و هـەروەها ئـەو زانیارییانـەی کـە ساڵەهایە لای خۆم کۆم کردوونەتەوە، وێڕای ئەوانەش هـــەر لەو ناوچەیەدا فرچکم بەژیانەوە گرتووە، هەوڵ ئەدەم بـەو پییـەی توانـاو بەشـێوەیەکی خێـراو جـەموجۆر چاوێ بخشێنم بەجـــۆگرافیای هـــەورامان و ناوچـەکانی دەوروبەریـدا، ئـەو چـــاو خشاندنەیش بە بۆچـــوون و لێکدانەوەیـەکی ســـەرپێیی ئـەو روانگایـە کـە لەلایـەن شاعیران و نووسەران و توێژەرانەوە لـەســـەر ئەم بابەتە نووسراون دەس پـێ ئەکـەم بەهیوای ئەوەی بتوانم بەبێ روتووش، ئەو دیمەنـەی کـە لـە واقیعـدا هەیـە بیخەمـە بەرچاو و بیناسێنین.

پێم خۆشە پێش ئەوەی بچمە سـەر باسـی جۆگرافیـایی، وەك لایـەنی بۆچوون و روونکردنەوەیـەکم ســـەبارەت بـە وشـەی هـــەورامان و مێـژوی ئـەدەبی هـــەبێ،

نامەوێت خۆم هەڵکێشم و بڵێم لە (ســەداســەد) ئـەوەی مـن دەڵـێم راسـتەو ریـشەو بناغـەی ئەم وشەیەم دۆزیوەتەوە، ئەرکوماندو بوونی ئەو هەرمانە قورسە بە زمـان ناسـان و مێژوونووسـان ئەسـپێرین، هـەر بۆئـەوەی گەراڵـەم وەکـو لایـەنێکیش لــەو باســـەدا هەبێت داوای لێبوردن و رێنوێنییان لێ ئەکەم، پێم خۆشە پێش هـــەموو بۆچوونی چەند نووسەرێ بخـەمــە بەرچاو، لەگـەڵ ئەوەشـــدا بۆچوونی عــامەی دانیشتوانی هەورامان، کە لەم بارەیەوە ئاوا دەڵێن.

**(هۆرئامان)** یانێ هاتوەتە سـەر یان بەرز بوەتەوە.

**(هەور ئاما)** یانێ هەور هات ئەمەش بەبۆنەی بەرزایی کوێستانەکانی کە زوربەی وەرزەکانی ساڵ هەوریان لە سـەرە.

**(هوور ئاما)** کە **(هوور)** لە ســەر شـێوە زمـانی کۆن، بـە مانـای خـۆر یـان هـەتاو (ئاما)ش بەمانای هات کە بە تێکرا ئەبێتە خۆرهات یان خۆر هەڵات.

بە بڕوای من هیچکام لەمانە جێگـای بـڕوا نـین و ئەوەنـدەش بایخیـان نییـە کـە مـرۆڤ خـــۆی پێـــوە مانـدوو کـات، بـابزانین سـەرچـــاوەکان لـــەم رووەوە چیمـــان بە دەستەوە ئەدەن.

لـە کتـێبی مێـژوی جـــۆگرافیای **(سیرالاکراد)** نووسـینی (عبـدالقادر)ی کـوڕی روستمی بابان لەســـەر ئەو بابەتە ئەڵێت (لە شێوەی زمـانی هـــەورامیدا بەبرسـی دەوتـرێ ئـاورا، ئـەو کەســـانەش لـەم ناوچـەیەدا ژیـاون، زۆربـەی وەخـت برسـییان بووە، بۆیە پێیان وتراوە ئاورامی).

ئەوەی راستە لە شێوەی هـــەورامیدا، بە برسی دەوترێ (ئاورا) بەو کەســـانەش زۆربەی وەخت برسییانە، دەوترێ (ئـاەرا لـــەم) بـەلاّم پـێش هـەمـوو شـتێك ئـەبێ ئەو دوو خاڵەی خوارەوە لە بەرچاو گرین.

یەکـەم: لـە دەوروبـەری هـەورامانا بێجگـە هەورامییـەکان هـیچ شـێوە زمـانێکی کەمان نییە بەبرسی بڵێت ئاورا، ئەوەش لە فام و مەعریفەی ئەو هۆزە بەدوورە ئاوا ناوێك بە خۆیانەوە بلکێنن.

دووهەم: بە پێی ئەو بۆچوونە ئەبوایا، هەر بە هەورامی بە هـــەورامان بووترایا ئاورامان، بە هــەورامیش بوترایا ئاورامی، کەچی وا نییە، ئەورامی و ئەورامان هـەر دوو لەزمانی فارسی سـەردەم وەرگـیراون هـیچ کـاتێکیش فارسـەکان بـە برسـی نـاڵێن ئاورا دەڵێن گڕسنە.

ئـــەبێ ئـــەوەش روون کەینـــەوە، زۆر وشـــەو واژەمـــان هـــــەیە لـــە کـــوردی هـــەورامانیدا بە(ه )و لە فارسـیدا بـە (ئـە) دەس پـێ ئـەکات، وەك (هـــەنار = انـار) (هـــەنجیر= انجیر) (هـارد= أرد) (هەورێشم= ابریـشم) (هـــەنگور= انگـور) (هـــەور = ابر) (هـومید = امید) ( هەرزان = ارزان) و........

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ، ئەو مانایە لـە دوو زمـانی جیـاوازەوە بـــە دوو مانای جیا لە یەك وەرگیراون زوریش لە یـەك دوورن، ئەگـەر هـاتوو بمانـەوێ مانـای فارسییەکەشی لێك دەینـەوە بـە پێـی قاموسـی بورهـانی قـاتع کـە یـەکێ لـە قاموسـە کۆنەکانی زمانی فارسییە، زۆریش جێگای بڕوایە مانای (**ئەورامان**) ئاوایە.

ئـەو وشـەیە لـە دوو بـەش (**ئـەور + مـان**) پێـك هـاتووە کـە (ئـەور) بـە مانـای قـــــەڵاو حەساری هێقم (مان)یش بە مانای شـــوێنی ئاسایش و ئەمن کە بـە تێکـڕا ئەبێتە جێگای هێقم و ئاسایش.

هەرچەندە ئەتوانین ئەو بۆچوونە بە پێوانەی ئەم خاڵانە بۆ وشـەی هـــەورامان بـاوەڕی پـێ بکرێـت کـە هـەورامان ناوچـەیەکی کوێـستانی و ســـەختڵەتە، بەبۆنـەی ئەسـتەمی شـاخ و داخیـەوە لـە زۆر هێـرش و دەسـدرێژی کـردن پارێزگـاری کـــراوەو پەناگایەکیش بووە بۆ لێقـەوماوان، هـــــەر لـە ســـەردەمی ئاشـوریەکان تـا ئـەمڕۆ، وێنەیـشی بنەماڵـەکانی هـەورامانی تەختـە، کـە هـەرکام لـە وڵاتێکـەوە هـاتوون و لەوێـدا جـێگیر بـوون، ئەمــە لــە شـێوە فارسـییەکەیدا نیـزیکترە لـە مانـای وشـەی هەورامان تا برسی.

ئەگەرچـی لەمەشـدا جێگـای گومانــە کـە هـەورامان لـە (ئـەور + مـان)ی فارسـی وەرگیرابێ بە بڕوای من هەورامان لە (ئەهورا) وە یان (ئاورومـان )ەوە وەرگـیراوە کـە ئەهورا لە ئاینی کۆنی ئەم وڵاتەدا بەمانای خوای گەورە هاتووەو( مان )یـش پاشـگرە بۆ بنەماڵە، کە ئەتوانین بڵێین هـۆزو بنەماڵـەی خواپەرەسـتان، کـە بـەتێکڕا ئەبێتـە (ئە هورامان)و بە مرووری زەمان ئەلفەکەی قرتاوەو بووە بـە (هـەورامان) بۆئـەوەی بڕوامان بەم بۆچوونە هەبێ بەڵگەو وێنەیە ســەرچاوەیەکی دی ئەخەینە بەرچاو.

لە کتێبی جۆگرافیای خۆرئاوای ئێران بە ناوی کێوە نەناسـراوەکانی خۆرئـاوا لـە ئەوێستادا بە نووسـینی ئەوێـستا ناسـی ئێرانـی (عمادالـدین دولتـشاهی) ئـەوەمان بـە جـوانی بـۆ روون ئەکاتـەوە، کـە هـەورامان لـە ئـەهوراوە وەرگـیراوە، ئـەوەش عـەینی وتەکەی دەوڵەتشاهی کە ئـەڵێت (عەشـیرەت یـان هـۆزی هـەورامی لـە ئـە هورامیـەوە وەرگیراوە، کە (ئە هورا) یان (ئەورا) لە فارسیدا کورتکراوەی (ئەهورایە)و (مان)یـش

لەسەر زمانی کوردیدا پاشگری بنەماڵە و عەشیرەیە، هەر بەم بۆنەیەوە بەم هۆزەیان وتووە ئەهورامانی یانی بنەماڵەی ئەهورایی).

وێنەیەکی کە، کە جێگای خۆیەتی لێرەدا باسی لێوە بکەم ئاوازێکی کۆنە بەناوی (ئەهورامن) یان (ئورامن) کە هەندێ لە سەرچاوەکان بەئاوازێکی فارسی کۆن یان پەهلەوی دادەنێن، ئەو ئاوازەش ئاوازێکی ئاینی و لە بنەماڵەی ئەهورایەکانەوە وەرگیراوە کە لە کاتی خۆیدا بەشێوەی گازەو پاڕانەوە بۆ ئەهورا مەزدایان خوێندووە، ئەو هۆزو بنەماڵەش لە نووسین و بەڵگەکانی مێژوویدا باسی زۆریان لەسەر کراوە، کە بنەماڵە و لایەنگرانی ئایینی زەردەشتی بوون.

بە بڕوای زۆرێ لە سەرچاوەکان لە قەراخی گۆمی ورمێ دا ژیان و پاشان چەند بنەماڵەیە لەو هۆزە بە ناوی ئورارتۆر کە لە مێژوودا بەناوبانگن بەرەو ناوچەکانی کرماشان و هەورامانی ئەمڕۆ هاتوون، هەتا مامۆستا دەوڵەتشاهی لە سەر ئەو باوەڕەیە  کە خودی زەردەشت پێغەمبەر، زۆربەی ژیانی لە ناوچەکانی کرماشان و هەورامانا بە سەر بردووە نەك لە خۆرهەڵاتی ئێرانا، را ستی یان ناڕاستی ئەو بۆچوونە بە مێژوونووسان و لێکۆڵەران دەسپێرین، لە پاڵ ئەوەشدا بە گوێرەی  ئەو شوێنەوارو ئاسارانەی کە لەو ناوچانەدا هەیە دوور نییە، کە ئەو بۆچوونەش راست بێ، بەهەر حاڵ باسی ئەو ئاوازەمان کرد کە بەناوی (ئەهورا مین) یان (ئەورامن)ە ئەو ئاوازەش بە ئاڵوگۆڕێکی کەمەوە، لەو دوو ناوچەیەدا ئێستاش جێگای رێزن، لە ناوچەی کرماشان بە ناوی (هۆرە) و لە هەورامان بە ناوی (سیاچە مانە) بە ناو بانگن ئەگەر بەوردی لەو ئاوازانە بکۆڵینەوەو گوێ رایەڵیان بین بۆمان دەرئەکەوێ هەر ئەو ئاوازەی (ئەهەورامین) یان (ئەورامن)ە کە لە ئەهورایەکانەوە وەرگیراوەو بەئاڵوگۆڕێکی کەمەوەو جێبەجێ کردنی شیعرەکانی، بەباشی پارێزگاری کراوەو جێگای رێزیشن، کە شەمس قەیس رازی لە کتێبی (المعجم) دا دێڕە شیعرێکی هێناوە، ئەوا ئێمەش هەروەکوخۆی ئەینووسینەوە کە ئەڵێت.

(لحن اورامی و بیت پهلوی        زخمه رود و سماع خسروی)

یانێ شێوەی هەورامی و شیعری پەهلەوی (زخمە) جۆرە کەرەسەیەکی موسیقایی کە لە سیمی ناسك دروس کراوە، هەڵپەڕکێ و چەپڵە لێدانی بەزمی خەسروانەش، لەم د ێڕە شیعرەدا بە جوانی نزیکایەتی ئەدەب یان دیالۆگ و قسەکردنی هەورامی و پەهلەوی دەسنیشان کراوە.

هـەروەها لـە کتـێبی ڕەسـەنایەتی زمانەکـەت بناسـە، بەنووسـینی مامۆسـتا هـەورامانی ئـەڵێت (بیروڕایـەکی دیکـەش هـەیەو باسـکردنی لەوانەیـە سـوودی خـۆی هـەبێ و ئـەوەیش ئەوەیـە کـە گوایـا، لـە دێـرین دەمـەوە (هوریـە) کـان، لـە ناوچـەکانی هـەورامانی دێرینـا ژیـاون و کـە ئـەو ناوچـەیەش زۆرتـر ناوچـەکانی هەورامانی لەهۆن دەگرێتەوە، بەڵگەش بۆئەوە ئەوەیە کە ناوچەی (هەوڵی) پاوە لـە (هـووری)یـەوە هـاتووە) بـەبڕوای مـن ئەگەرمامۆسـتا هـەورامانی لـە بـاتی ناوچـەی هەوڵی چاوگەی هـەوڵ بنووسـیبایا جـوانتر بـوو، کـە ئـەوەش لەخۆیـدا بۆچـوونێکەو جێگای باسیشە.

یان (ئاورومان) کە هەندێ بیرو بۆچوونیش لەم بارەیەوە هەیە جێگای خۆیـەتی باسی ئەوەش بکەین وەك، جۆرج کامەرۆن لە کتـێبی ئێـران لـە سـەرەتایی مێـژوو لاپـەڕەی (١٠٨)دا ئـەڵێت (لـە سـەردەمی ئاشـوور بـانی پاڵـدا یـانێ سـاڵەکانی (٨٦٠ - ٨٨٥ ی)پێش زاینی سـەربازانی ئاشووری بـەزنجیرە کێوەکـانی (ئاورومـان) لـە خـۆرهـەلاتی شـارەزوورەوە گەیـشتن ئـەو ناوانـە، پـاش سـێ شـەڕی قـورس ئـەو ناوچانەشیان خستە ژێر دەستی خۆیان) کە ئەمڕۆش لە کێوەکانی بەشـی خۆرئـاوای هەورامان روو بە شارەزوور شوێنێکمان هەیـە پێـی ئـەوترێ (کلاوی ئاشـوور) گوایـا لـەوە گیراوە ئاشـووریەکان لـەو کاتـەدا ئەوەنـدەیان لـە دانیـشتوانی ئـەو ناوچـەیە کوشـتووە، لـە کەللـەی سـەر کلاویـان بـۆ ئـەو کێـوە دروسـت کـردووە، کـە لـە کتـێبی مێـژووی مـاد بـە نووسـینی دیاکۆنۆفـدا راسـتەوخۆ بـەو شەڕوپێکاچـوونە ئامـاژەی کردووە، بەس لێرەدا وشـەی (ئاورومان) هـاتووە زۆر دووریش نییە هـەورامان لە ئاورومـان گیرابـێ کـە بـە مانـای مـەڵبەندی یـان شـوێنی ئاگـر کـە هـەمان پارێزەرانی ئاگر یان مەڵبەندی ئاگر ئەگرێتەوە.

یەکێ تر لە بۆچوونەکان بۆ مەڵبەندی ئاگر ئەوەیە، گوایا لە کاتی خۆیدا لە سەر بـەرزترین کێـوی هـەورامان کـە شـاهۆیە ئـاگری سروشـتی یـانێ (بۆرکـان) یـان (ئاگرپـژێن) هـەبووە ئەگەرچـی ئـەم بۆچـوونە بـە شـێوەیەکی زانـستی دەستنیـشان نـەکراوە، دوور نییـە کـە ئـەو بۆچـوونەش راسـت بـێ، بـۆ ئـەوەیش باوەڕمـان بـەم بۆچـوونەش هـەبێت دەگەڕێنـەوە سـەر نووسـراوەیەکی کـۆن لەسـەر هـەورامان نووسـراوە، ئـەویش نووسـراوەی یـەکێ لـە نووسـەرانی سـەردەمی دەسـەلاتدارانی ئەردەلانیـە بـە نـاوی (عـەلی ئەکبـەری وەقایـەع نگـار) لـە لاپـەڕەی (١٨٤) مێـژووی هـەورامانی موزەفـەرخانی بەهمـەن سـولتان لـە زمـانی ئـەو نووسـەرەوە ئـاوا ئـەی

گێڕێتەوە، (هەقیر عەلی ئەکبەری کوردستانی کە نووسەری ئەم ریسالەیەم لە ساڵی (١٢٨٠ ه ق) بۆ گەشتێکی زانستی چووم بۆ سەر ئەو کێوە (یانێ شاهۆ) لەسەر بەرزاییەکانی ئەو کوێستانەدا هەندێ بیری گەورەی سروشتی تێدا بوون، کە دانیشتوانی ئەو ناوانە پیان ئەوتن (نوور) کاتێ بە وردی دەوروبەری ئەو نوورانەم پشکنی جۆرە بەردێکی (متخلخلە)م بە شێوەی (سەنگ پا) دەست کەوت کە پیشاندەری ئەوە بوون سەردەمێکی زۆر کۆن ئەو (نوور)انە شوێنی بۆرکان یان ئاگر پژێن بوون). ئەگەر ئەم بۆچوونەیش رۆژێ بێتە پێش بە شێوەیەکی زانستی روون بێتەوە لە کوێستانی شاهۆشدا ئاگر پژێن وجودی هەبووە، ئەوا ئەکرێت بڵێین کە هەورامان لە (ئاورومان) یان مەکانی ئاگر گیرابێت کە مەکانی ئاگر هەم بۆ ئاگری سروشتی هەم بۆ ئاگری دەسکرد کە شوێنەواری هەردوویان لەو مەڵبەندەدا هەبووە.

بە گوێرەی ئەو بۆچوون و نووسراوانە، لەوەی زیاتر نزیکمان ئەکاتەوە کە هەورامان لە (ئەهورا) یان بنەماڵەی (ئەهەرا ئیان) وەیان (ئاورومان) بەمانای مەڵبەندی ئایریان ئاور وەرگیرابێ کە لە درێژایی مێژوودا بە سوانی هەندێ لەو پیتانە بووە بە هەورامان، باسکردن لەسەر وشەی هەورامان ئەوەندەیان پێچاندووە بە راستی مروڤ تووشی سەر لێشێواوی ئەکات، بەس لەوەی زیاتر ئێمەیش لە سەری ناڕۆین و ئەچینە سەر باسی جۆگرافیایی.

# جۆگرافیای هەورامان

**ئەم بابەتەش لە خۆیدا ئەبێت بە دوو بەشەوە،**
**یەکەم: جۆگرافیای ئەدەبی.**
**دووهەم: جۆگرافیای سروشتی.**

**بەشی یەکەم: جۆگرافیای ئەدەبی**

فەرهەنگی ئەدەبی نەتەوەیی مێژینەیەکی زۆر کۆن و پڕ لە شانازی هەیە کە باس و لێکۆڵینەوەی لە روانگایەکی زانستییانە و عیلمانییەوە هەرمانێکی زۆر قورس و لە توانای هەرکەسێکدا نییە، لەبەر ئەوەی توێژینەوە و لێکۆڵینەوە پێویستی بە کەرەسە و پێداویستی بە خۆی ئەکات و کات و زەمەنێکی زۆرو تایبەتی ئەوێ و بە رەوتێکی سەرپێیی و ماوەیەکی کەم ناکرێ بە تێر و تەسەل لەو بارەیەوە بدوێین و تەواوی لایەنە دیار و نادیارەکانی دەسنیشان کەین.

لە لایە تریشەوە لە بەرهەندێ هۆکاری سەرەکی کە زۆرتر ئەگەرێتەوە بۆ نەبوونی توانا و دەسەڵاتی خۆماڵی نەمانتوانیوە ئاگاداریەکی هەمەلایەنەمان لە تەواوی بابەت و بوارە ئەدەبییەکانی کوردی هەبێ.

ئەو زانیاری و ئاگادارییەش کە هەیە زۆر کەمە، لە بەر ئەوەی داگیرکەران و چەوسێنەران هیچ کاتێ نەیانهێشتووە بۆ خۆمان وەك گەلانی سەربەخۆی دیکەی ئەم دنیایە بژین و تەواوی جوانی و ناشیرینی و دیاردە و رووداوەکانی رابردوومان بە شێوەی زانستییانەی بەربلاّو تۆمار کەین و لە ئەرشیفێکی مێژووییدا پارێزگاری بکرێن و بدرێنە دەستی دوارۆژ، بەم بۆنەیەوە زۆری لەو رووداوە مێژوویی و بابەتە ئەدەبییانەیان لەناو چوون و یان لە بیر چوونەتەوە و نەکەوتوونە بەر دەستی هەمووان و یان لە نێو بەیازو دەسنووسەکاندا ماونەتەوە و کەسانێکی زۆر کەم ئاگادارییان لەو بارەیەوە هەیە.

بەس زانیاری هەمەلایەنە لێرەدا بەربەس ئەکرێ و ئەگەر منی هەورامانی باس لەسەر مێژووی ئەدەبی هەورامی ئەکەم، یان ئەو بەرێزەی لە سەر ئەدەبی سۆرانی و کرمانجی سەروو، زازایی و کەڵهوڕی ئەکەن لە بەر خۆهەڵکێشانی ئەو لایەنانە نییە، ئەگەر هاتوو لەم روانگایەوە سەیری ئەم نووسراوەیە بکرێت ئەوا ددان بەوەدا ئەنێین کە منی هەورامانی لە هەر کەسێکی دی زیاتر زانیاری و ئاگاداریم لە ئەدەبی

هەورامی هەیە هەروەها ناوچەکانی تری کوردستانی خۆشەویست لە منی هەورامانی زیاتر زانیاری ناوچەکانی خۆیان هەیە.

با ئەوەش روون کەینەوە ئێمە ئەگەر باسی جۆگرافیای ئەدەبی هەورامان ئەکەین بەو شێوەیە تێ نەگەن تەواوی ئەو ناوچانە هەورامی بوون، وەك هەندێ لە نووسەران دێڕە شیعری هەورامییان لە هەر مەڵبەندو ناوچەیەکدا دەس کەوتووە بە هەورامی زمانیان داناون، زیاتری گوستەرە یان بەربڵاوی ئەم ئەدەبە لە وڵاتان و ناوچەکانی تردا هەڵ ئەگەڕێتەوە سەر دوو بابەت، یەکەم نزیکایەتی دیالیکتی هەورامی لە زمانی پەهلەوی و ئاویستایی دووهەم بە زمان بوونی ئاینی یارسانی، بەر بڵاوبوونی ئەو ئاینەیش کە زیاتری دەفتەرو نووسراوەکانیان بە شێوەی هەورامین، بووە بەهۆی سەر لێشێواندنی زۆری لە نووسەرو لێکۆڵەرەکان، کە پاشان لەسەر ئەوانەیش ئەدوێین.

بەگوێرەی ئەم بیرو باوەڕو بۆچوونە، بە پێویستی ئەزانم منیش بە پێوەری زانیاری و ئاگاداری لە سەر ئەدەبی هەورامی بدوێم و بە شێوەیەکی کورت لە چەند دێڕێکدا بۆچوونی خۆم دەربڕم.

جێگای خۆیەتی لێرەدا ئەوەش بڵێم زۆربەی مێژوونووسان و نووسەران و لێکۆڵەرانی، ئەم بەشە ئەدەبەیان بە ئەدەبی گۆران داناوە و ناویان لێبردووە من بەش بە حاڵی خۆم تەنها باوەڕم بە هەورامی بوونی ئەم بابەتە لە ئەدەبیاتی کوردیدا نە گۆران بەواتەی ئەمڕۆ.

لەبەر ئەوەی گۆرانەکان تیرەیەکی بچووکن لە ناوچەی گەهوارە و کۆزەرانىدا ئەژین کە شێوەی دیالۆگ و قسەکردنیان دەچێتەوە سەر بەشی کەڵهوڕ نە هەورامی، ئەو شێوە زمانەش لە رابردوودا نووسراوە یان تێکستی بەو شێوەیە نەبووە کە بتوانێ بەشی باشووری کوردستان لە ژێر دەسەڵاتی خۆی بگرێ، هەتا مامۆستا مەردۆخ لە تاریخی کورد و کوردستان لاپەڕەی ١٠٨دا ئەڵێت عەشیرەتی گۆران نزیك بە شەش هەزار خانەوارن کە لە خۆرئاوای کرماشاندا ئەژین کە ئەبن بە شەش تیرە، قەڵخانی، بێ بیانی، نەیرێژی، گەهوارەیی، کانی زەنجیری و رێزەهۆیی، کە ناوەندیان گاوارەیە.

یان مامۆستا حەمە عەلی سولتانی، لە کتێبی ئەیلات و هۆزەکانی کرماشان ئەڵێت (کاکڵەو بناغەی گۆران لایەنگری ئاینی (ئەهلی هەق)ن کە بەزاراوەی کەڵهوڕ کە تایبەتی ناوچەی گۆرانە ئەدوێن).

هـەروەها (ئـا، ئـارلۆف) لـە (جەسـتار)هـا یـان بـە شـوێنا گـەڕان و لێکدانــەوەی سـەرزەوینی خۆرهەڵاتـدا ئـەڵێت، (هـۆزی گۆرانـەکان بـریتین لـە، کـەڵخانی، تفنگـی، بێبیانی، نرجەکان، قادر میروەیسی) عەلی رەزم ئاراش، لەکتێبی جـوگرافیـای ئێــران بەرگی پێنجــەمدا ئەڵێت ( گۆران یەکێ لە بەشەکانی سەر بە شارستانی شابادە، کـە شوێنی جۆگرافیائییان بەم شێوەیە، لە باکورەوە تا گەورە دیەی سەنجاوی و ناوچـەی وەڵەدبیگی و باوەجانی، لە خۆرهەڵاتەوە دووبارە بەشی لە سەنجاوی و باوەندپوری و شاباد، لە باشوورو باشووری خۆرئاوا بەناوەندی کرند و پشت تەنگی ئەژدەها).

لەم بۆچوونانەدا هەنـدێ شـتمان بـۆ دەرئەکـەوی، یەکـەم ئـەوەی کـە جۆگرافیـای ژینگەی عەشیرەتی گۆران بەواتەی ئەمڕۆیی لە کوێدایە، دووهەم بـە یـەك نـەزانینی عەشیرەتی گۆران و هەورامی سێهەم بەیـەك زانـینی زاراوی کـەڵهورو گـۆران، وادەزانم تەواوی ئەو تێکەڵ کردنانـە بـەو شـێوەیە بەسـتی ئاگـاداری بێـت، ئـەوەی کـە ئـەمڕۆ ئێمە بە ناوی هەورامی و گۆران ئەیان ناسین لە دابەشکردنی زاراوەکاندا ئەچنە دوو خانەی جیاوازەوە، لە بەر ئەوەی ئەو عەشیرەتەی ئەمڕۆ ئێمە بـەناوی گـۆران ئـەیان ناسین ژینگەی جۆگرافیاییـان دیـاری کـراوەو چـەند هـۆزێکن لـە ناوچـەی گـەهوارەو کۆزەراندا ئەژین و شێوەی دیالۆك و قسە کردنیشیان (ئەڕئەڕا)یـە کـە ئەچـێتە سـەر بەشی کەڵهوڕ نەهەورامی.

ئەگەرچی ئەکرێ لە ڕوانگایە ترەوە سەیری ئـەو رووداوە بکـەین و زۆربـەی ئـەو زاراوانە سەر بە گۆران بزانین، بـەڵام ئـەوەی دەچـێتەوە بـۆ سـەردەمێکی زۆر کـۆن و بناغەی جیا بوونەوەی زمـانی کـوردی و فارسـی، بـۆ ئـەوەی باوەڕمـان بەمـەش بێـت ئاماژە بە سەرچاوەیەکی کە ئەکەین.

ئــەویش نووســراوەی نووســەرێکی پــێش زاینــە بــەناوی ئــسترابۆن، لــە کتــێبی (زاراوەکــانی گــۆران) بــە نووســینی (کاریــل هــدنگ) نووســەری ئــەڵمانیا ئــەڵێت (زاراوەکانی بەشی گۆران بریتین لە کەنوڵەیی، هەورامانی، باجـەڵانی) پاشـان لەسـەر وشەی گۆران ئەڕوات و بـە لێکدانـەوەو لێکۆڵینـەوییێکی زانـستییانە بـەو قەناعەتـەی ئـەگات کـە گۆرانـەکان یـەکێ لـە گـۆنترین عەشـیرەتەکانی ناوچـەی کوردسـتانن، بـۆ ئەوەی بۆچوونەکەشی جێگای باوەڕ بێت، دوو وێنەمان بۆ دێنێتـەوە، یەکـەم ئـەڵێت (لە سـەرەتای پێکهـاتنی دەسـەڵاتی ئەردەڵانییـەکان هێزێکـی گـەورەی گۆرانیـان پێـك هێنا بە ناوی کڵاو سپیەکان ئەوەش بـەو بۆنەیـەوە لـە جـۆرە کڵاوێکـی ئاسـنی سـپی کەڵکیان وەرئەگرت، هەر ئەو تایبەتمەندییە لە هێزی کوردەکانی کەو فارسەکاندا کە

ئەوانیش لە جۆرە کڵاوێکی سوورو رەش کەڵکیان وەرئەگرت جیا ئەکرانەوە، وێنەی کڵاوەکانیش هەر لەو سەرچاوەیەدا هاتوون.

دووهەم: بۆ دێرینەبوونی ناوی گۆران ئاماژە بە نووسراوەی ئستڕابۆن ئەکاو ئەڵێت (لە کتێبی جۆگرافیای ئستڕابۆن بەرگی شەشەم دێڕی ٥٣١ ئاماژە بە شارێ ئەکا بەناوی **ساراپارای**) هەر لەزمانی ئستڕابۆنەوە ئەڵێت (شارای ساراپارای لە باشووری ئەرمەنستان لە نزیکی مادو گـــۆران دایە) کە ئەکرێ ئەم (ساراپارای) هەر ئەو (ساپاردۆ) یان (ساپارۆ) بیت کە لە کتێبەکەی ئاشووریەکان لە هێرشەکانی سارگۆنی دووهەم بۆ ناوچەکانی خارخارو مادای ناوی هاتووە، ئستڕابۆن کە ٦٠ ساڵ پێش زاین هاتوەتە دنیا ئەو جۆگرافیایەی لە ١٧ جەڵدا نووسیوە بەم شێوەیە لەپاڵ ماددا ئاماژەی بەناوی گۆران کردووە پاشان کاریل هدنگ لە سەر ئەوەی ئەچێت و ئەڵێت (گۆرانەکان لەدرێژایی مێژوودا یەك جێنشین ولە بەرزاییەکانی زاگرۆسدا ژیاون و وەك تیرەکانی تری کورد نەبوون کە کۆچەربن) ئەم تایبەتمەندییە تەنها لە هەورامییەکانی ئەمڕۆدا بەدی کراوە، بەم بۆنەیەوە ئەگەر ئەو بۆچوونە راست بێ ئەبێ هەر لە کۆنەوە بە هەورامییەکان و دانیشتوانی ئەم بەشەی زاگرۆس وترابێ گۆران، من لەوەی هەورامییەکان گۆران بن یانا؟ پێ دانــاگرم بەوەش دەزانم کە هەمووی ئەو تیرە و هۆزانە سەر بە میللەتی کوردن و هیچ کەسێ ناتوانی لێکیان کاتەوە، بەڵام لێرەدا باسی دابەشکردنی زاراوەکانی زمانی کوردییە هەتا ئەگەر باوەڕمان بەو دابەشکردنەی شەرەفخانی بەدلیسی بێ، چۆن جافەکان و دانیشتوانی مەریوان کە سەر بەکرمانجی ناوەڕاست یان سۆرانن، وە گۆرانەکان کە سەر بە زاراوەی کەڵهوڕن و هەورامییەکان کە سەر بە زاراوەی ماچۆن، هەموویان کراون بە گۆران، بۆئەوەی جوانتر روونی کەینەوە ئەو هۆزانەی ئەمڕۆ بە زاراوەی کەڵهوڕی و هەورامی ئەدوێن بە شێوەی جیاواز ئەیان نووسینەوە تا روون بێتەوە ئەو هۆزانە لە کاتی دابەشکردنی زاراوەکاندا بەکام تیرەی سەرەکی کورد نزیك و ئەچنە کام خانەوە.

زاراوەی کەڵهوڕی: کە بە زاراوەی (ئەڕا ئەڕا) ئەناسرێت بریتییە لە کەڵهوڕ، لەك، گۆران، سەنجاوی، وە فەیلی.

زاراوەی هەورامی، کە بەزاراوەی (ماچۆ) ئەناسرێت بریتییە لە، هەورامی تەخت و لەهۆن، کەنوڵەیی، هەمەوەندی، هەتا ئەکرێ شەبەك و زازاکانیش بە بەشێ لەم زاراوەیە بزانین.

بەس لێرە دا زۆر شتمان بۆ روون بوویەوە کە عەشیرەتی ئەمڕۆی گۆران لە خۆرئاوای کرماشان تا گەهوارە و نزیکی باواجانی ئەژین، کە ئەوەش جیا لە جوگرافیای سروشتی ئەمڕۆی هەورامانە.

تەنها نزیکایەتیەکە بووەتە هۆی سەرلێشێواوی زۆربەی مێژوونووسان و لێکۆڵەران ئەوەیە کە بەشێکی زۆر لە عەشیرەتی گۆران لە سەر بیرو باوەڕی ئایینی (یارسانین) کە زۆربەی نووسراوە ئایینییەکانیان بە شێوەی هەورامی بووە و دیارە ئەم ئایینەش لە کۆنەوە لە نێو میللەتی کورددا رەواجی هەبووە و زۆربەی مێژوونووسان و رۆشنبیرانی ناوخۆو دەرەوە هەرمانیان لەسەر کردووەو تەواوی ئەو مەتن و تێکستانەی کە دەستیان کەوتوون بەم شێوەیە بووە پاشان لە بەر بەستی ئاگاداری و زانیاری لەم بارەیەوە کاتی دابەشکردنی ناوچەکانی کوردستان ناوی گۆرانیان بۆ ئەم بەشە داناوە، یان خەیر هەر لە سەر ئەو بیرو باوەڕە کۆنە هەموویان بەگۆران داناوە.

ئەگەر بێتو باوەڕیان بەوەی پیدا کرد کە زاراوەی گۆرانی ئەمڕۆ جیاوازی لەگەڵ زاراوەی ئەمڕۆ و هەورامیدا هەیەو بەو ئاگادارییەش هەر بڵێن شێوەی گۆران لە واقعیەت دوورەو وەك ئەوەیە بڵێین زمانی قورئان کە عەرەبییە و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن میللەتی کورد بەوە خوێندن و نووسینیان دەس پێکردووە یان هەزاران شاعیر و نووسەریشمان هەیە کە بەو زمانە شیعر و نووسراوەیان لێ بەجێ ماوە بڵێین زمانی کوردی، کە ئەوەش شتێکی پەسەند نییە ئەگەرچی ئەم زاراوەیەو یەك ریشەیان هەیەو ئەو زمان، بەڵام وێنەکە بۆ بابەتی ئاینیەکەیە کە دوور لەباوەڕە، بەس ئەم دوو بابەتە جیاوازن و نابێ لە دابەشکردنی ناوچەییدا تێکەڵ بکرێن.

ئەگەرچی ئەم باسە پێویستی بە روونکردنەوەی زیاتر هەیە بەڵام لە بەر ئەوەی دەمەوێت لەسەر جوگرافیای ئەدەبی هەورامی لە ئەدەبیاتی کوردیدا روون کردنەوەیەکمان هەبێ لەوەی زیاتر لە سەر ئەو بابەتە ناڕۆین و دێڵینیەوە بۆ زەمان و کاتی تایبەت بە خۆی و دەچینەوە سەر بەشی جوگرافیای ئەدەبی هەورامی.

بە هەرحاڵ کاتێ کە ئەمانەوێ باس لە سەر بەشێ لە ئەدەبی هەورامی و ئاڵوگۆڕی مێژوویی و چۆنیەتی پێکهاتنی قۆناغەکانی بکەین، پێویستە هەڵگەڕێینەوە بۆ دوارۆژانێکی زۆر دوور و بنج و بناوانی بدۆزینەوە کە ئەوەش لە خۆیدا هەرمانێکی ئاسان نییە، هەرچەند سەرەتای پێکهاتنی ئەدەبیاتی کوردی بە

تەواوی روون نەبوەتەوە، کە ئەوەش چەند هۆیەکی تایبەت بە خۆی هەبووە کـە بـە شێوەیەکی کورت ئاماژەم پێکرد.

لە لایە تریشەوە ئەو واتا و نووسراوانە بە کەڵکن و لە دڵی خوێنەر یان بیسەردا جێگای خۆیان ئەکەنـەوە، کـە لـە واقعیـەت نزیـك بـن و بەڵـگەشیان بـۆ حەقانیـەتی خۆی هەبێ باش بەوەش ئەزانین کە مێژووی گـەلی کـورد مێژوویـەکی بـێ ئەرشـیف بووە و هیچ جێگایەکی بۆ کۆکردنەوە و پارێزگاری ئـەو بەڵـگانەی نـەبووە، لـە پـاڵ ئەمەشدا بە شانازییەوە ئـەتوانین بڵـێین کـە لاپـەڕەکانی مێـژوو شـتانێکی وامـان بـە دەسـتەوە ئـەدەن بابـەتانی زۆر لـەم روانگایـەوە روون کەینـەوە و تەنانـەت ئـەدەبی هەورامی بە دایکی ئەدەبیاتی کوردی و کۆنترین زاراوەی ئەم وڵاتە دابنێین، بۆ وێنـە دوکتۆر مارف خەزنەدار لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا ئەڵێت: (شێوەی شـیعری گـۆران کـۆنترین تێکسـتە لـە ئـەدەبی کوردیـدا، یـا خـۆ بـە واتەیـەکی تـر ئـەتوانین بڵـێین سەرەتای مێژووی ئەدەبی کوردی بە شێوەی گۆران (هـەورامی) دەسـتی پـێکـردووە). ئـەو واتایـە باشـتر هانمـان ئـەدا کـە بـە وردی چـاوێ بگێـڕین بەسـەر نووسـراوە مێژووییەکانمان تاکو بە شێوەیەکی زانستیانە و راستەقینە ئەوەمان بـۆ دەرکـەوێ و روون بێتـەوە کـە ئـەدەبی هـەورامی یـەکێ لـە کـۆنترین دارشـتەکانە لـە ئـەدەبیاتی کوردیدا و ئەتوانین باوەڕمـان بـەوەش زیـاتر بـێ کـە خزمایـەتی و نزیکایـەتی زۆری لەگەڵ زمانی ئارياییەکان یان ئێریین واچەکاندا هەیە.

مامۆسـتا هـەورامانی لـە فەرهـەنگی ئیریـن واچـەکاندا ئـەوەی بـە جـوانی لێـك داوەتەوە و روونی کردوەتەوە و لە پاشان ئـەڵێت: (وشـەی ڤـاچ = واچ زۆر کۆنـە و لـە ئەڤێستادا بـەو جـۆرە واتایـەی کـە لێکمـان دایـەوە چـەندەها جـار هـاتووە و زمـانی ئەڤێستاش بە زمانی ئیرینڤاچ ناو براوە) هەر وەهـا لـە شـوێنێکی کـەدا ئـەڵێت (ئـەم فەریزەیە «واچەواچ» بە واتایەك دێ کە مەبەستی بەدەستەوەدانی ناوی شێوە زارێکـە کە «رەگی» یاخود قەدی واچی زۆری تێدایە ئەویش شێوەزاری ماچۆیە، ئـەمڕۆش لـە زۆربەی ناوچەکاندا بە شێوەزاری هەورامی ئەڵێن شێوازی ماچۆ) ئەمەش زۆرتـر دڵ گەرممان ئەکا کە بە وردی سەیری کـۆنترین نووسـراوەی ئیریـن واچـەکان بکـەین کـە ئەویش ئەوێستایە.

ئەگەرچی هەندێ لە رۆشنبیران و شاعیران و نووسەرەکانمان لە سەر ئەو باوەڕەن کە ئەوێستا بە هەورامی نووسراوە من ناتوانم بە تەئکید لە سەر ئەوەی پێ داگرم و بڵێم وەهایە، بەڵام ئەتوانم بڵێم کـە یـەکێ لـە نـزیکترین زاراوەکانـە کـە تێکـەڵاوی و

نزیکایەتییەکی زۆری لەگەڵ زمانی پەهلەویدا هەیە هەورامییە، بەبێ شك زمانی پەهلەویش پاشماوەی زمانی ئەوێستایە، هەتا زۆربەی نووسەران و مێژوونووسان باوەڕیان لە سەر ئەوەیە لە دەورانی ئەشکانی و ساسانییەکاندا ئەوێستا بە زمانی پەهلەوی نووسراوەتەوە بۆ وێنە فەرهەنگی دهخودا لە مانای وشەی (اوستا) ئەڵێت خەتی ئەوێستا جیابووی خەتی پەهلەوییە کە ئەوێستا بەو خەتە نووسراوەتەوە.

یان لە پێشەکی فەرهەنگی موعین لاپەڕەی (١٣)دا ئەڵێت کتێبەکانی پەهلەوی کە زیاتریان لە سەر ئاساری زەردەشتین، خەتی ئەم ئاسارانە بە شوێناهاتووی خەتی کتێبەکانی پەهلەوییە، شێوەی نووسینیشیان هەر ئەوەیە لە کتێبەکانی پەهلەوی کە تایبەتی ئەدەبیاتی زەردەشتین، وەك (دینکرت، بندهش، داتستان دینیك، ماتیکان، کارنامەی ئەرتەشیر بابەکان، درخت ئاسوریك و...) کە کۆنترین وێنەی ئەم ئەسەرانە بەڵگە یان سەنەدێکە کە لە هەورامانی کوردستاندا دۆزراوەتەوە کە ئێستا روون بوەتەوە ئەو سەنەدە بە زمانی پارتی (پەهلەوی) نووسراوە نە ئارامی.

یان مامۆستا حەیرەتی سەجادی لە کتێبی (شاعران کرد پارسی گوی) لاپەڕەی ٢٩ دوو بەیتیەکی لە بابا تاهیری هەمەدانی هێناوە کە جیا لە باسەکەی ئێمە نییە ئەویش ئەوەیە:

ئەگەر روزی دوو سەد باروت بوینۆم
بە جان موشتاق باری دیگەر ستونۆم
زبان پەهلەوی را اوستادەم
کتاب عاشقی را مستر ستۆنم

هەر ئەو سەرچاوەیە لاپەڕەی ٢٨ مامۆستا سەجادی لە ئەحمەدی کەسرەوییەوە، ئەیگێڕێتەوە (لە خۆرئاوای ئێران تا ئاسیای بچووك لە خاکی فارس و کرماشان جیا لە ناوی کورد هیچی کەیان نەبووە و زمانیشیان بە پێویستی ناوچەیی پەهلەوی، ئەشکانی یان ساسانی بووە. یان لە لاپەڕەی ٢٥دا ئەڵێت، پیرنیا و ناتل خانلەری ئەڵێن: (مادەکان زمانی پەهلەوییان بە خەتێ ئەنووسی کە لە ئارامی وەرگیرابوو بە پەهلەوی ئەخوێنرایەوە کە پێی ئەوترا هوزوارش) کە ئەم جۆرە نووسینەش تا پەنجا ساڵی رابردوو لە تەواوی ناوچەکانی کوردستانا باو بوو کە بە خەتی عەرەبی و فارسی کوردییان ئەنووسی و بە کوردی ئەیانخوێندەوە، کە زۆرتر لە فارسی کەڵکیان وەرئەگرت.

ئەوانە هەموویان ئەوەمان بۆ روون ئەکەنەوە ئەوێستایی و پەهلەوی لە یەکەوە نزیك بوون هەروەها تێکەلاویی هەورامی لەگەڵ پەهلەویدا.

ئەگەر لە روانگایەکی لێکۆڵەرانەوە چاوێ بگێڕین بە نووسراوەکانی ئەوێستادا بۆمان دەرئەکەوێ کە وشەی هەورامی زۆری تێدا بەدی ئەکرێت، لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە کە چۆن بووە ئەوێستا یان بەواتایەك کە زمانی پەهلەوە لە کاتی خۆیدا لەزاراوەی هەورامی کەڵکی وەرگرتووە، بۆ وێنە سەیری ئەم جەدوەلە بکەین.

| ئەویستایی (پەهلەوی) | هـــــەورامی | فارســـی |
|---|---|---|
| دەدەمەهی | مــە ذە یمی | میدهیم |
| تەرەســەنتی | تەرسی تەرسای | ترسیدن |
| پەرســـــە | پەرســـــە، پەرسای | سئوال کن، بپرس |
| أتر | ئاتر، ئایر | أتش |
| ئەنیشك | ئەنیشك قوڕانیشك | أرنج |
| ئەز | ئەز، ئەمن | من |
| ئازوش | ئازا | زرنگ |
| بەرەت | بەرۆ | می برد |
| هوشکــە | وشکە | خشك |
| هەنگەن | هەنگە | زنبور |
| ئەهور | مەن هو، خوا | خدا، یزدان |
| ئەسمەن | ئەسمەن ئاسمان | أسمان |
| ئەختی | ئاخ و داخ | أخ، ناله درد |
| ئەپ | ئاوی، ئاو | أب |
| دروك | درۆ، دروێ | دروغ |
| ئەسپە | ئەسپ | اسب |
| سەرتە | سەردە، سەردا | سەرما |
| نمنە | نمە , نما | نماز |
| کئۆش | گۆش | گوش |
| مەخشی | مەشی | مگس |
| یەوکەشە | یەو جاڕە | کشتزارجو |

وەزۆرها شتی کەی لەم بابەتە ئێمە هەروەها کە وتمان ناتوانین باوەڕمـان بـەوەی هەبێ کە ئەوێستا بە زاراوەی هـەورامی نووسـراوە بـەڵام ئـەتوانین ئـەوەی بڵێین لـە کاتی دانان، یان دووبارە نووسی ئەوێستادا هەورامی زمانێکی خاوەن دەسـەڵات بـووە، لە بەر ئەوەی هیچ زمانێکی کەم دەسەڵات ناتوانی تێکەڵاوی و تەئـسیرگوزار بێـت لـە زمانێکی بە دەسەڵاتدا، مەگەر ئەوەی کە ئەو زمانەش خۆی خاوەن دەسەڵات بێ.

کەواتە ئەو بڕوایـەمان زیـاتر ئـەبێ کـە شـێوەزمانی ئـەمڕۆی هـەورامی لـە کـاتی نووسـینی ئەوێـستادا خـاوەن دەسـەڵات بـووە تـا ئـەو رادەیـە کـە زمـانی نووسـینی ئەوێستای ئەو سەردەمە کەڵکی لێ وەرگرتووە، کە ئـەوەش بـێ شـك نزیکایـەتی ئـەم زاراوەیە لە زمانی پەهلەویوە.

بەس ئەتوانین بڵێین ئەمە یەکی تر لەو هۆکارانەی بووە کە ئەدەبی هەورامی لە ناوچەکانی دی ئێرانی ئەمڕۆ و دەرەوەیدا جێگای خۆی بکاتەوە.

ئەگەرچی تا رادەیە لە بابەتەکەی خۆمان دوور کەوتینـەوە، وادەزانم کـە ئـەوەش پێویـست بـوو لـە بـەر ئـەوەی کـاتێ باسـی جۆگرافیـای ئـەدەبی دێتـە ئـاراوە ئـەبێ بناغـــەو بنـەوانی سـەرەتایی بدۆزینـەوە و بـزانین کـە ئـەو ئەدەبـە لـە کوێـوە سەرچاوەی گرتووە و هۆکاری بەر بڵاوییەکە چییە؟.

ئەگەرچـی ئـەبوایا لـەوەش زیـاتر لـە سـەر ئـەم بابەتـە بڕوایـام، لـە بـەر ئـەوەی ناوەڕۆکی باسەکەی من شتێکی کەیە، ئەبێ بچمەوە سـەر باسـی جوگرافیـای ئـەدەبی هەورامی، کە ئەوەش لە خۆیدا ئەبێ بە دوو بەشەوە.

یەکەم: ئەو نووسراوانەی بە شـێوەی هـەورامی نووسـراون و دوور لـە ناوچـەکانی هەورامان بوون و زۆربەی نووسەرەکانیشیان هەورامی نەبوون.

دووهــەم: ئــەو نووســـراوانەی کــە بــە شــێوەی هــەورامی نووســـراون و نووسەرەکانیشیان هەورامی بوون، چ لە هەوراماندا چ لـە دەرەوەی هەورامانـدا، یـان هەورامی نەبوون بۆ ماوەیە لە ناوچەکانی هەوراماندا ژیاون.

## بەشی یەکەم

ڕەنگە بۆ دەسپێکردنی ئەم بەشە جێگای خۆی بێت کە ئاماژە بە تاکە دێڕێکی دانیشتوانی ناوچەی قەزوین بکەم کە لە سەرەتای هاتنی ئیسلام بۆ ئەو ناوچەیە وتراوە زۆریش لە شیعری ئاتران نزیکە:

نە مـــوسلمان بیم نە گزێت مەدەیم

بشـــی او مکـــەشـــی کا ما بـــڕەیـــم

واتە نە موسڵمان ئەبین نە جزیەش ئەدەین ئێوە بڕۆنەوە بۆ مەکە و ئێمەش لە جێگای خۆمان دەمێنینەوە، ئەگەر بێت و لە ڕوانگەیەکی بەراوردکارییەوە سەیری ئەو دێـڕە بکەین بۆمـان دەرئەکەوێ کە جیاوازییەکی ئەوتۆی لە سەر شێوەی هەورامی کۆن ناکەوێتە بەرچاو، یان نزیکایەتی ئەم دێڕ لەگەڵ شیعری ئاتران، هەتا ئەتوانم بڵێم ئەو بۆچوونەیش ڕەد ئەکاتەوە کە باوەڕیان بەو شیعری یانی ئاترات یان (هورمزگان) نییە، لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە ئاراوە هۆکاری ئەوەی چی بووە کە لەو سەردەمەی ئەدەبی هەورامی بگاتە ناوچەی قەزوین.

لە لایە ترەوە لە سەرەتای هاتنی ئیسلام بۆ هەورامان و ناوچەکانی دەوروبەری پارچە شیعرێکی ئاتران هەیە ڕاستە هێشتا شاعیرەکەی و شوێنی گوتنی بە جوانی ڕوون نەبوەتەوە، وائەزانم ئەو کەسەی کە ئەم شیعرەی گووتوە لە ناوچەی سلێمانی ئەمڕۆ تا سەید سادق یان شارەزووردا ژیاوە.

ئـاتران کـــوژران هـــورمزگان ڕەمـــان

هـــوشان شـاردەوە گـەورە گـــەورەکان

زۆر کـار ئـارەب کـــردنا خـاپـــوور

گنا ئـــی پاڵـــە هـــــەتا شـــارەزوور

شـــەن و کـــەنیـــەکان وە دیـل بـشینـا

میـــرد ئـازا تلیـــۆ وە رووی هـــوێنـا

ڕەوشـــە زوردەشـت مـــانی و بـێ کـەس

بـــزیکا نـە هـات هـورمز وە هیـچ کـەس

ئەگەرچی ئەم چەند دێڕە شێعرە لە زۆر شوێندا نووسراوە و باسی زۆری لەسەر کراوە کەچی هێشتا زۆر لایەنی نادیاری تێدا ئەکەوێتە پێش چاو، کە یەکێ لەوانە شوێنی جۆگرافیایی دانانی ئەو شیعرەیە، هەروا کە وتمان من بەش بە حاڵی خۆم وا ئەزانم لە نێوان سلێمانی تا شارەزووردا وێژراوە، ئەویش لە بەر ئەم هۆکارانەی خوارەوە.

یەکەم: لە ناوەرۆکی شیعرەکەدا ئەڵێت، (گنا ئی پاڵە هەتا شارەزوور) هەر وەها کە ئەزانین کاتی خۆی هێزی موسڵمانەکان لە خۆرئاوا و باشووری خۆرئاواوە، بەرەو ناوچەی هەورامان هاتوون، کە لەو نیوە دێڕەدا ئەڵێت ئەکەونە ئەم ناوانە هەتا شارەزوور یانی لەو شوێنەوە کە هاتووە هەتا شارەزوور ئەو شوێنەش دیارە جیا لە ناوچەی هەورامانی ئەمڕۆیە، ئەگەرچی هەندێ لە نووسەران و لێکۆڵەران (پاڵە)یان بە شار داناوەو مانایان کردوە کە ئەوەش لە خۆیدا بەستی ئاگاداری لەسەر چۆنیەتی دیالیکتی هەوراميیە، ئەگێنێ پاڵ بەمانای دامێنگەی کێوی نیزیك بەئارانە نە شار.

دووهەم: (تاریخ کامل ابن اثیر) ئەڵێت لە کاتی هاتنی موسڵمانان بەرەو ناوچەی شارەزوور بە فەرماندەهی عوتبەی کوڕی فەرقەد چەند شەڕێکی ناوچەیی ئەو ولاتەشیان خستە ژێر دەسەلاتی خۆیان، بەلام لەو شوێنەی کە نیشتەجێ بوون، لە بەر ئەوەی کە دووپشکی زۆری بوو هەر کەسیشیان ئەگەست ئەمرد بەفەرمانی خەلیفە، پاش چەند شەڕی دیکە کوردی زۆریان کوشت و تا ناوچەی ئازەربایجانیان خستە ژێر دەستی خۆیان.

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ ئەو شوێنەی بۆ ماویە تێدا ماونەتەوە بێگومان عەربەت بووە کە وا لە نێوان سلێمانی و شارەزووردا، کە دووپشکی عەربەت ئێستاش بەناوبانگە، بەس لێرەدا ئەوەمان بۆ روون ئەبێتەوە ئەو شیعرە لەوکاتە و لەو ناوچەیەدا وتراوە، یانێ لە نێوان سلێمانی و شارەزووردا.

ئەگەرچی هەروا ئاماژەیشمان کرد هەندێ کەس بوونی ئەو شیعرە رەد ئەکەنەوە، تا کاتێکیش نوسخەی راستەقینەی شیعرەکەمان نەکەوێتە دەست لە بەرابەری ئەو کەسانەوە بێدەنگ ئەبین، پاش هاتنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ ناوچەکانی کوردستان بەتایبەت هەورامان ئەدەبی هەورامی نە ئەوەی بەربەست نەکرا هەتا لە زۆربەی ناوچەکانی کوردستاندا پەرەی سەند، بە بڕوای من هەندێ لە هۆکارەکانی ئەو پەرەسەندنەش ئەمانەی خوارەوەن.

یەکـەم: هـەروا کـە لێکمـان دایـەوە یـەکێ لـەو هۆکارانـەی نزیکایـەتی زاراوەی هـەورامی لـە زمـانی پەهلـەوی بـووە کـە لـەو سـەردەمانەدا بـە زمـانی ئـاییني زەردەشتییەکان ئەناسرا.

دووهەم: بە بۆچوونی هەندێ لە نووسەران و مێژوونووسان کە لێکیـان داوەتـەوە زۆربـەی دانیـشتوانی ناوچـەکانی هـەورامان پـاش هـاتنی ئیـسلامیش تـا ماوەیـەکی درێژخایەن لەسەر ئایینی کۆنی خۆیان ماونەتەوە و لەبەر برێ هۆکاری سەرەکی بـە تایبـەت بابـەتی جوگرافیـایی کەسـانێکی زۆر لـەم لاو لـەو لاوە روویـان کردوەتـە هەورامان و بە مەڵبەندێکی ئاسایش و پیرۆزیان زانیـوە کـە بنەماڵـەکانی هـەورامانی تەخت وێنەیەکن بۆ ئەم بۆچوونە.

سێ هەم: هەروا لە پێش‌دا باسمان کردو ئەوەمان روون کردەوە کە نووسـراوەکانی ئـایني یارسـانی بـە شـێوەی هـەورامی نووسـراون، ئـەو ئاینـەش هـەر لـە کۆنـەوە لـە زۆربەی ناوچەکانی ئێران و کوردستانا لایەنگرانی زۆری هەبووە بەتایبـەت دەورانـی پەردیوەر لە هەوراماندا، کە نووسراوە مێژوویی و دەفتەرەکانی یارسـان بەڵـگەیەکی باوەڕپێ‌کراون بۆ ئەم وتەیە.

ئەگەر لەروانگایەکی وردبینانەو لێکۆڵەرانەوە سەیری جەرەیانی مێژوویی بکەین بۆمـان دەر ئەکـەوێ کـە ئـەم بابەتانـە، بـێ‌لایـەن نـەبوون لـە پەرەسـەندنی ئـەدەبی هـەورامی لـە ناوچـەکانی تـردا، لـە بەرئـەوەی باسـەکەمان درێـژە نەکێـشێ لـە هـەر ناوچەیەك بە وێنەیەك قەناعەت ئەکەین هەڵبەتە بێ لێکدانەوە.

یەکێ لەو شوێنانەی کە لە کۆنەوە لانکەی ئـەم ئەدەبـە بـووە ناوچـەکانی خـوڕەم ئاباد و لۆڕستانە، کە شاعیرانی زۆری لێ هەڵکەوتوون، وەك، بـالولی دانـا یـان بـالولی ماهی، بابا لـوڕی لۆڕسـتانی، بابـا حاتـەمی لۆڕسـتانی، بابـا رەجـەب و خـاتو جـەلالیی لۆڕستانی، ئەوەش وێنەیەکی شیعری بالولی دانا:

ئـەز بەهلوولـەنان جـە رووی زەمـینی
چـــارفـــریـــشتانم چـاکـــر کـــەرێنێ
نجـــوومم ســـالح رەجـــەبم پـێنێ
چـــەنی لـــوڕە بیم جـــەماو هەفتینێ

واتـه مـن بـەهلوولم كـه لـەم سـەرزەوینەدا ئـەژیم، چـوار كەسـی وەك فریـشته هـاوڕێیم ئەكـەن، كـه ناویـان نجـووم، سـاڵح، رەجـەب وه لـوڕە، بـوین لـه كۆگـای هەفتەوانەدا.

له لۆڕسانەوه دێینـەوه بـۆ ناوچـەكانی بـەختیاری تـا پـشكۆی ئـیلام و كـەڵهوڕ، میرزا قولی بەختیاری (شارق) ئەگەرچی زۆرتر به هەرسینی دەیناسن، ئەڵێت:

حـــــەقش وه دەستــــەن. ..............
یاران ئەو شـەخه حــەقش وەدەستــەن
ژەقـــــەید دنیـــا تەمـــام وارەستــــەن
ژەجـــامی بـادەی ویلایـەت مــــەستەن
مەردحـــەق ئەوەن تـەركی دنیـای كـەی
پەی دیاری هــــەق پیـــر پەیــدا كـەی

یەكێ تر له كەسایەتییه بەناوبانگانه غـولاٚمڕەزا ئەركـەوازی لـه (پـشكۆی ئـیلام) كه ئاوا دەڵێت:

بینـــای لامـــــەكان. ..................
قـــادر قــــودرەت بینای لامــــەكان
ئیلت جام به تۆن یا زات ســـوبحان
نەجاتم بدەر لـەی بەنـــدی زینـدان
پەنام هـەرتۆنی یـەكتای بـێ هـەمتا
وەی بەندی زینـدان مـن ببـۆم رەهـا

عەباس خانی كەڵهوڕی:

هــامـــســـەران خانــــی..................
بەقـــا نـــەذارۆ ئــەی دنیـــای فــــانی
پیـــر مــەوی دڵـــڕێش وه پەشیمـانی
بــــەقـــانــــه ذارۆ ئـەی دنیــای فـــانی
عـــەقڵو هـۆش و فـام جـەلات رەم مـەبۆ
زەرەی جــــوانیت یەكجـــار كـەم مـەبۆ

لەوێوە بەرەو ناوچەی هەمەدان ئەڕۆین و ئەچینە خزمەت پیری هەمەدان کە ناکرێ هەروا ئاسان بە لایا تێپەڕین، بابا تاهیری هەمەدانی ئەگەرچی ئەمڕۆ زۆربەی شیعرەکانی لە بەر دەسکاری کردنی زۆر رەنگو بۆی فارسییان بە خۆیانەوە گرتووە لە پاڵ ئەوەشدا هەندێ لەو شیعرانەی هێشتا لە باری ڕێزمانییەوە بۆن و بەرامەی کوردیان پێوە دیارە، بۆ وێنە.

پەنج رۆی هەنی خۆرەم کیهان بی
زەمین خەندان و برمان ئاسمان بی
پەنج رۆی هەنی ها زەیدو سامان
نە چینان نام و نەژانان نشان بی

ئەگەر بە وردی سەیری ئەم دوانەیە بکەین هەندێ وشەی تێدایە کە تایبەتی شێوەی هەورامین وەك: (هەنی، زەیدوسامان، رو، چینان و ژانان) کە وشەی (چینان) ئەگەر لە روانگایەکی ڕێزمانییەوە سەیری بکرێت دەبینین (چین+نان) کە الف و نون لێرەدا پاشبەندی کۆیەو تایبەتی زمانی کوردیە، ئەم وشەیە ئەمڕۆ بەبێهیچ ئاڵوگۆڕێ لە هەورامیدا بەکار دەبرێ کە (چینان یانێ چینیشان) کە ئەبێتە ئەمانە ئەم جۆرە بابەتە لە شیعری بابا تاهێری هەمەدانیدا زۆرن، کە مامۆستا هەورامانی لە لێکدانەوەی ئەم شیعرەدا برمانی، بە(بەرمان) یانێ پۆشاك مانا کردوە کە برمان هەر ئەو (پرمە) یان (پرمان)ی هەورامییە بەمانای دەس پێکردنی گریان بەدەنگی بەرزو ناوامە، کە لێرەدا تەشبهە بۆ گریانی ئاسمان کە بارانە، یان ئەم دوانەی کە زۆر دەسکاری نەکراوە.

ئەز ئان ئەسپیدە بازووم هەمەدانی
بەتەنهایی کەرۆم نەچیروانی
همە بەمن و دیرند چەرغ و شاهین
بنام من کرند نەچیروانی

ئەو دێڕە شیعرە کە لە کتێبی مێژووی ئەدەبیات ئێران دوکتۆر زەبیحاللە دەرمهێناوە کە ئەویش ئەڵێت لە گەڵ چەند دووانەیەك و پارچەیەکی سەربەخۆ لە کاتی خۆیدا ئاغەی موچتەبا مینویی لە کتێبخانەی ئەستامبووڵ دەستی کەوتووە و

منیش بە بێ دەستکاری نووسیومەتەوە، ئەمە لە خۆیدا وێنەیەکە بۆ دەسکاری شیعرەکانی بابا تاهێر.

لە هەمەدانەوە بەرەو ناوچەکانی هەرسین و سەحنە و کەنگاوەر ئەگەڕێنەوە و چەند شاعیرێکی ئەو ناوانەش بە سەر ئەکەینەوە، وەك مەلا وڵەوخانی هەرسینی، میرزا عەلی خانی هەرسینی، ئەڵڵاً مورادی هەرسینی، مەلا پەرێشانی دینەوەری، شێخ عەلی سەحنەیی و...

ئەگەرچی هەندێ لە نووسەران مەلا وڵەوخان سەر بە عەشیرەتی گۆران لە ناوچەی کۆزەران و گەهوارە ئەزانن، کە ئێمە لێرەدا بە چەند دێڕێکی میرزا عەلی خانی هەرسینی قەناعەت ئەکەین :

موفارقەت سەخت. ......................
دەردنیەن وێنەی موفارقەت سەخت
هیجرانی ئەویار تازە بەست رەخت
مەخسوس پەری کەس هەرجوون من بەوبەخت
زدیدار ئەو مودەتێ بیم شاد
ئاخر دەس تەقدیر شادیم دان وەباد

مەلا پەرێشانی دینەوەری:

ساقی باوەرە جامێ پەی مەستی
سوودم مەستیەن زیان ژهەستی
جامی کە مەغزم باوەرۆ وە جۆش
دنیا و مافیها بکەم فەرامۆش

ئەگەرچی مەلا پەرێشان زۆربەی شێعرەکانی بە شێوەی لوڕی و فارسین لەم بابەتە شیعرانەیدا دەرئەکەوێ کە لە شێوەی هەورامیش بە جوانی کەڵکی وەرگرتووە، هەر ئەمەش ئەو روانگایە یانێ نزیکایەتی دیالیکتی هەورامی بەزمانی پەهلەوی بۆ دەرئەخات، لەبەر ئەوەی کە دیالکتی لوڕیش یەکێ لەو دیالیکتانەیە کە بە زمانی پەهلەوییەوە نزیکە، هەر ئەمەش بوەتە هۆیە کە زیاتر لوڕیش لە کوردی نزیك بێت و بەکوردیشی بزانن.

له سەحنەش کەسایەتییەکی وەك شێخ نـەزەر عـەلی و شێخ ئـەمیرمان هـەبووە ئـەوەش چـەند دێـڕێ لـە پارچـە شـیعرێکی نەزەرعـەلی هەرچـەند کـە شـێوەی گوتنەکەی تێکەڵاوێکی هەورامی و لەکییە کەچی ناتوانین هەروا بە لایا تێپەڕین:

تۆ کە حـــەرف من مـەکەی فـەرامۆش
پەس تۆ بواچـــە تامـن بکـــەم گـــۆش
واتـــی گیان بـــدەم وە وەسـڵ بڕەسـم
چ ســـــەودای موفتی کەفتەن وە دەسم

لـە دینـەوەرو سـەحنەوە بـەرەو کەنوڵـە ئـەڕۆین، راسـتە کـە ناوچـەی کەنوڵـەش هـەورامین ئەگەرچـی بـە ساڵاچـوونی ناوچـەکە باوەڕیـان لـە سـەر ئەوەیـە لـە هەورامانەوە بەرەو ئەو ناوچەیە کۆچیان کردووە، لە بەر ئەوەی کە ئەمڕۆ دەستیان لە هەورامان بڕاوە، بە ناوچەیەکی جیاواز دێتە ئەژمارەوە.

ئەگـەر بـەوردی سـەیری ئـەم ناوچـەیەش بکـەین دەبیـنین کەسـایەتی خـاوەن قەڵـەمیان لـێ هەڵکـەوتووە و خزمـەتی باشـیان بـە ئـەدەبی کـوردی کـردووە، کـە وێنەشیان ئەڵماس خانی کەنوڵەییە، لـە سـەر ئـەو نـەمرە ئەوەنـدە بەسـە کـە بڵێین (فیردەوسی کوردەواری) ئەوەش وێنەی شیعری.

میــــرزام شــــادەنی. ......................
میرزام شــــادبە تۆ خاتـــر شــــادەنـــی
ســـــەیـــد ســـارا و کۆ ســــەر ئازادەنـــی
خــــاتــــر بێ ئازار خـــەم وەبادەنـــی
نەك چون من پابەست بەنـدی بـەڵانی
مــــورغ ئاسـای قــەقنەس قەهرقـەڵانی

لەوێـشەوە دێینـەوە بـۆ ناوچـەی کرماشـان و مایەشـت، لەوێـدا شاعیرانی زۆرمـان بووە کە خزمەتیان بـە ئـەدەبیاتی کـوردی کـردووە وەك سـەی براکـە و مـیرزا عـەلی لاچـینی و حـەیران عـەلی مایەشـت و سـەی یـاقوی مایەشـتی و... کـە یـەکێ لـەو ئەویندارە دڵ سووتاوانەی شیعرو ئەدەبی کوردی سەید یاقوی مایەشتی بووە، کە بـە شێوەی هەورامی شیعری دڵداری تەڕ و پاراوی زۆری داناوە، ئەمەش وێنەیەکی.

شیــــرین تــۆڕ تـــا کـەی. ..................
دڵــدار دێـــرین شیـــــرین تــۆڕ تاکـــــەی
بێ مـــەیلی تا چـەند چەفاو جەور تاکـەی
عـومرم تـەمام بـی شـەرت و سـەور تاکـەی
یـــا بـە ئاشـــــکار یـــا بـــە نیهـــانـــی
چـــــــوون هـــەردەجاران وێــت نمــەنمانی

ئەگەرچـی وتمـان بـێ لێکدانـەوە کەچـی جارجـار نـاتوانین بـەلای هـەنێ بابـەتا تێپەڕین، بۆ وێنە وشەی (نمەنمانی) بڕواتان بێت کـە ئـەمڕۆ لـە هەورامانـدا خـودی هەورامیمان هەیە ناتوانی ئاوا بە شیرین و پاراوی وشەی (نمە نمانی) دەربڕێت.

لە مایەشتەوە بەرەو کرند و سەرپێڵ زەهاو ئەڕۆینـەوە، کـاتێ بـە وردی سـەیری ئەو ناوچەیەش ئەکەین بۆمان دەرئەکەوێ کە شاعیرانی باشی تێدا هەڵکەوتووە و لە بـوارێکی سـەرەوی ئـەدەبی کوردیـدا هـەنگاویان هـەلگرتووە، وەك خانـای قوبـادی، عەبدوڵلاّبەگی شەرەف بەیانی و... کە بە راستی خانای قوبادی لە رادەیـەکی بـەرزی ئـەدەبیاتی کوردیـدا جێگـای خـۆی کردوەتـەوە، ئـەتوانین بـە سـەرقافڵەی ئـەدەبی وەرگێڕانی کوردی دەسنیشانی کەین، ئەوەش وێنەیە لە شیعری خانا.

میــــرزام خـــاڵ لــەیل. ....................
وەســـواسەم کەردەن نوختــــەی خـاڵ لـەیل
ئەگریجـــەی پەل دێز پای دەسمـــاڵ لـــەیل
ئەبــــرۆی تاق نمـــای چـــوون هیلال لەیل

ناوچـەی کرنـدیش لـە دێرینـەوە خواسـتیارو رێـڕەوی ئـەدەبی کـوردی شـێوەی هەورامی بوون شاعیرانێکی زۆریـشی لـێ هەڵکەوتووە کـە هـەنگاویان بـۆ بـەرەوپێش بردنی ئەم ئەدەبە هەڵگرتووە بۆ وێنە، دەروێش عەباسـی کرنـدی، دەروێـش قـولی کردنـدی، دەروێــش ئـەیازی کردنـدی و... ئـەوەش وێنەیـە لـە شـیعری دەرویـیش عەباسی کردندی.

ســـڕ حـــەق زانـۆ. ..................
داخـــم پەی دۆستێ ســڕ حــەق زانـۆ
بەڵــێ ئەو ســڕە پـەی کـــەس نـەوانۆ
تا وە ڕۆی ئەلـەست پەنەش مــەمانۆ

لێــرەوە دەڕۆینــەوە بــەرەو کوردســتانی خۆرئــاواو دەچــینەوە بــۆ ناوچــەکانی دەوروبەری کەرکووك لـە وێشدا شـوێنانی وەك هەمەوەنـد و زەنگەنـەمان دەکەوێتـە پێش چاو، ئەگەرچی ئێستاش زۆربـەیان هـەورامین کەچـی لـە هـەورامان دابـڕاون و دوور کەوتوونەتەوە لە ڕابردوو و ئێستاش‌دا شاعیرانی زۆریـان لـێ هەڵکـەوتووە وەك مەلا عومەری رەنجووری لە کەرکووك، فەقێ قادر لە هەمەوەند و میرزا مـەحموود و مەلا نوشاد و مەلای جەباری و مەلا موحەممەد لە زەنگەنە، ئەتوانین دوو کەس لەو شاعیرانە لـە ئاسـتێکی سـەرەوەدا جێگایـان دەستنیـشان کـەین، ئـەو دووانـەش فـەقێ قادر و رەنجوورین، ئەوەش چەند دێڕێ لەو دووانە، فەقێ قادری هەمەوەندی.

قــــــەید زەنجیــــــرم.....................
یـا شـــا نـە قـــەلا قــەیـــد زەنجیـــــرم
دەمێـــوەن مـــەقهور قەهـــر مەشـهوورم
چــەمەڕای هیممــەت شـــای خیبــەرگیرم
ســـەر خێـلێ ئەقـــوام مەینــەت کێـشانم
مــەحرووم دیــدار قـــــەوم و خوێـــشانم.

رەنجووری.

چــراغ نەوســوەیل..........................
ئارۆ ســـەرکێشا جـــە کــەل نەوسوەیل
رەنگ رژی باخان هـەم ئـاوەرد وە مـەیل
پەرێ گـــوشـــادی خـــاتـــران کـــەیل
تەلـمیت کــەم خـاو دیـای یەمــەن شار
جە هـەرمەتایە چـەند هـەزار کـەرد بـار

لـه كەركووكـەوە بـەرەو ناوچـەی سـلێمانی دێـین و لەوێـشدا دەچـینە خزمـەتی شـاعیرێکی کـەی ئـەو نـاوە ئـەویش مـەلا عەبـدوڵڵای زیوەریـە، ئەگەرچـی زۆربـەی شـیعرەکانی بـە شـێوەی سـۆرانین کەچـی جارجـاریش تەقـەی لـە دەرکـەی شـیعری هەورامی داوە وەك.

نــەو وەهــار بەزمــەن. ......................
پەرێ عــاشقــان نـەو وەهــار بەزمـــەن
وەشـــی دەروونـەن ســـەیــران رەزمـــەن
عـــالـــەم دڵگـــوشا ئاهـەنگش عەزمـــەن
عـــالـــەم بـەرگ ســـەوزپۆشان سەراسـەر
یەکـسەر جەننەتـەن سـارا و دەشـت ودەر

لــە ســلێمانییەوە دووبــارە هــەڵ ئەگەڕێینــەوە بــۆ کوردســتانی خۆرهــەڵات و دەچینەوە بەرەو ناوچەی هەوشار، لە وێشدا شاعیرانی زۆری ئـەم بابەتـە ئەدەبـەمان ئەکەوێتە بەرچاو وەك، خەلیفـە ئەڵماسـی گـەزەردەرەیی، مـەلا فـەرەجی بۆرەکـەیی، مـەلا ئەبوبـەکری یوسـفی، مـیرزا موحەممـەدی هەوشـاری و باباجـانی بۆرەکـەیی. ئەوەش چەند دێڕێ لە گەزەردەرەیی:

تــــــوەن تاومــــــەن. ..................
ئیمـشـەو بڵێـسـەی تـــوەن تاومــــەن
نـیش دەرون دڕچــــەرگ شـــکاومەن
ناڵەی قـــەیس ئاسا پـای بەرکاومـەن
کـــــورەی ئەخـــگەری تـەن سۆزانمەن
شۆڵەی نار جـە فـەرق ئـەفروزا نمـەن

لە هەوشارەوە بەرەو ناوچەی دیواندەرە و حەسەن ئاوا ئـەڕۆین و لـەو ناوانەشـدا دوو شـــاعیری دڵ ســـووتاومان ئەکەوێتـــە بەرچـــاو ئـــەوانیش ســـەید شـــوکرڵڵای قووچـاخی و ســـەید عەبـــدولڕەحیمی مەهجوورییـــە، ئـــەوەش چـــەند دێـــڕێ لـــە مەهجووری.

ئــارۆ دیــارەن شـــوورم نـــە ســـــەرەن
کـــــۆرەی سینەکــەم کـۆرەی ئەخگــەرەن
پزیــسکـەی پڕشـنگ زوخـــاڵ جـــەرگم
شیـشــەی دڵ تــاوا ســـــۆزنا بـــەرگــم
مـەر نەشئـــەی نەسیـــم پیرجــام مــەی
بـسانۆم جـــە دەس سـەدای چـەنگو نـەی

لەوێـشەوە دێینـەوە بـۆ ناوچـەی سـنە و ئـەو شـوێنە پـیرۆزەش لـە بـەر ئـەوەی ماوەیەکی درێژخایەن مەڵبەند و مەکۆی دەسەڵاتدارانی ئەردەڵانی بووە و هەروا کە دەزانین زۆربەی دەسەڵاتدارانی ئەو بنەماڵەیە ئـەدیب و ئـەدەب پـەروەر بـوون بـەم بۆنەیەوە زۆرێ لە شاعیران و نووسـەران روویـان کردوەتـە ئـەو شارە و لـە ئاسـتێکی بەرزدا خۆیان نواندوە، کە وێنەیان زۆرە و ناکرێ ناوی هـەموویان بـەرین، بـەس بـە نــاوی چـــەند کەســێکیان قەناعــەت ئەکــەین، وەك ئایــەتوالله مـــەردۆخ، دوکتـــۆر سەعیدخانی کوردستانی، غـوڵام شـاخان یـان خەسـرەوخانی ناکـام مـەڵالوتفوڵا شـێخ الائیسلامی (سەرعی)، شێخ موحەممەدی فخروالعلما (حەیران)وە....
ئەوەش چەند دێڕێ لە پارچە شێعرێکی خەسرەوخانی ناکام.

میــــــــرزام زام حــــــەی. ..................
ئەفـــــلاتوون فــــامان حــــەکیمان حــەی
دانـــایان دەور دانـــش کــــــەردەن پــــەی
پـــــەی ئــازار دڵ نیــشــان دان دووبـــەی
بـەی چـــە بـەی ســـەمەر نەونـەمام نـەی
خۆلاسەو خۆش بۆ خۆشمـەزە چون مـەی

جێگـای خۆیـەتی لەوێـشەوە سـەرێ بـدەین لـە ناوچـەکانی بیجـاڕ و گەڕوسـی و ئەچـینە خزمـەت جـەوادخانی گەڕوسـی و نەجـەفخـانی بایـنـدوری ئـەوەش چـەند دێڕێ لە پارچە شیعرێکی بایندوری.

شـيرين ســـەهـــمناك. ......................
سەنگینتـەر جـە خـۆف شـاهی ســەهـمناك
قـەدت بەرزەن چون، قولـەی پـای ئـەفلاك
گیسوت چـــون مـاران کـەتف شـای زوحـاك
زوڵفت چینچینـــەن بـەڕز چیـــن بەستەن
بە وێنـــەی شـــامار قـــەلب من گـەستەن

لێـرەدا دێینـە کۆتـایی ئـەم بەشـە، هەرچـەندە زۆر کـورت و بـێ لێکدانـەوە بـە شێوەیەکی سـەرپوتککراو بـوو، کەچی بۆمـان دەرکـەوت لـە بـەر ئـەو هۆکارانـەی لـە پێـشدا باسمـان کـرد، ئـەم بابەتـە یـانی جوگرافیـای ئـەدەبی بۆتـە هـۆی ئـەوەی کـە ئەدەبی هـەورامی لـە چوارچـێوەی ناوچـەکانی هەورامانـدا بەربەست نـەکراوە و بـۆ ماوەیەکی درێژخایەن زمانی ئەدەبی بەشێکی گەورەی کوردستان بـووە کـە مێـژووی دێرینیش شاهیدی ئەم بۆچوونەیە.

## بەشی دووهەم

هـەروا لـە پێـشدا وتمـان لـەم بەشـە باسـی ئـەدەبی هـەورامی لـە جوگرافیـای ناوچەکانی هەوراماندا ئەکەین، چ ئەوانەی هەورامی بـوون یـان هـەورامی نـەبوون و لە ناوچەی هەوراماندا ژیاون یان هەورامی بوون و لە دەرەوەی هەوراماندا ژیاون.

لـە بەرئـەوەی نووسـراوەکەمان بـە درێـژا نەکێـشێ، بـە چـەند وێنـە و خـاڵانێکی سەرەکی قەناعەت دەکەین.

ئـەو بەڕێزانـەی کـە ئاگـاداری ئـەدەبی هـەورامین بـەوەی بـاش ئـەزانن کـە ڕۆڵـی مێژوویی ئەم ئەدەبـە لـە ئـەدەبیاتی کوردیـدا چۆن و چـەندەها شـاعیر و نووسـەری بەدەسەڵات لەم ناوچەیەدا هەڵکەوتوون و خزمەتی شایانیان بە فەرهەنگ و ئەدەبی نەتەوەیی کردووە هەتا لە زۆر بابەتـەوە ڕچەشـکێن و سـەرقافڵەی ئـەدیبانی کـوردی بـوون، یـەکێك لـەو کەسـایەتییانە شـاعیری پایەبـەرزی هـەورامانی تـەخت سـەیدیی هـەورامی یەکەمـە، ئـەبێ بڵـێین یەکـەمین کـەس بـووە کـە شـیعری (مولەمـەع)ی هێناوەتـە نێـو ئـەدەبیاتی کوردییـەوە، ئەگەرچـی مامۆسـتا خەزنـەدار لـە مێـژووی ئـەدەبی کـوردی لاپـەڕەی ٢٠٠دا ئـەڵێت شـیعری (مولەمـەع) یـان تێکـەڵاو لـە لایـەن مامۆستا نالییەوە هاتوەتە نێو ئـەدەبیاتی کوردەوارییـەوە و پاشـان مامۆسـتا سـالم و هتـد... نـاو ئـەبا ئیـدی باسـێ لـە کەسـایەتییەکی وەك سـەیدی ناکـا، کـە لـە سـەدەی نۆهەمی کۆچی ئەو ڕەوتەی لە ئەدەبیاتی کوردیدا بە شـێوەیەکی بـەربڵاو هێناوەتـە ئاراوە، ئەوەش دوو وێنەی.

وێنەی یەکەم هەورامی بە فارسی.

ئەبرۆ کەمونی دابینیش تیرێـوە نـەی گـۆشـەو دڵـیم
مـــژگان اوکـــرد بە دل زخـــم گـــران المستغـاث
ئاوفەردەنم زومیونیـون میـشەم دەردون کزێـوم گیـون
یاران کجـا مـرهـم کنم زخـم گـران المـستغـاث

وێنەی دووهەم هەورامی بە عەرەبی.

ئەر سەراسـەر زیلۆ مـن گێلێش پۆنـە
غیـر حبك في فـؤادي لیس شیـيء
شێخ و پیر و مەلا و میر گرد عاشق و
مـا علیهـم لـومـة الاعلـى

ئەم بابەتـە شیعرانە لـە دیوانی سـەیدیدا زۆرن بـە تایبـەت تێکـەڵاوی فارسـی و هەورامی ئەگەر بە وردیش بیانخەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوە دەبینین بە شێوەیەکی تایبەتی کە برەوی شیعری کلاسیکی غەیرە کوردی بوون وان لە چوارچێوەی میزانی دارڕژاویٚ کە پێی وتراوە (عەرووز) هەتا ئەتوانین بە یەکەمین کەسی دانێین کـە ئـەو دارڕژاوە یانی (عەرووز)ی هێناویەتە نێو ئەدەبیاتی کوردییەوە، لە لایە ترەوە سەیدی یـەکێ لـەو شـاعیرانەش بـووە کـە ئاگـاداری باشـی لـە سـەر شـێوەی هـەورامی کـۆن هەبووە و بەو زاراوەش شیعری زۆری داناوە، یان کاتێ باسی ئـەدەبی هـەورامی دێتـە ئـاراوە نـاتوانین لـە بەرابـەری کەسـایەتێکی وەك بێـسارانی بـێلایـەن بـین و نـاوی نەبـەین، هەرچـەند لـە سـەر بێـسارانی زۆر وتـراوە و زۆریـش نووسـراوە، لـە پـاڵ ئەوەشـدا ئـەزانم بێـسارانی لـەوەی زیـاتر مافـی بـە سـەر هەموانـەوە هەیـە، بـەم بۆنەیەوە ئەتوانین بڵێین بێسارانی بە شاعیرێکی وێنەگر و دیمانەسازێکی سروشتی و ئەویندارێکی دڵەوداو بـووە، بۆیـە شـیعرەکانی لەگـەڵ هەسـتی مرۆڤایەتیـدا تێکـەڵ ئەبن و بە دانەری سەبکی رومانتیك لە ئەدەبیاتی کوردیدا ناسراوە.
ئەوەش چەند وێنە لە شیعرەکانی.

بـە دامـانت بـۆ. ......................
سا سـوەیل دەسـتم بـە د امـانت بـۆ
ئەوسـا جـە یەمـەن بـەر ئامـانت بـۆ
ئـەوەڵ ڕشـتەی سـەوڵ خـەرامانت بـۆ
سا سـوەیل سـەرم نـەڕات توفـەیل بـۆ
ئانـە مـەرەژی با بـالأی لـەیل بـۆ

و یان.

چڵـــێ جـــە پـەنا. ..................
چڵێ چـوون ڕەقیب مـدران جە پـەنا
هـــۆر ئامـــان مدران نە رووی تەمـەنا
مـــەر باد قـــودرەت بـــدەرۆش فـەنا
وەباد قـــودرەت لـــەتار لـــەتـــار بـۆ
نمـــازۆ بـالآی قیبـــلەم دیـــار بـــــۆ

یان میرزا عەبدولقادری پاوەیی کە لە بابەتی ناساندنی بەشێ لە جوگرافیای کوردستان بە شێوەی شیعری دەستێکی بالآی هەبووە و جێگای خۆیە لێرەدا ئاماژە بە چەند دێڕێ لەو بابەتانەی بکەین، لە پارچەی شنۆی سەحەرخێز کاتێ لە کاشتەر نامەیە ئەدا بە شەماڵ و ڕەوانەی پاوەی ئەکا و ئەگاتە سەر یەکێ لە بەرزترین لووتکەکانی شاهۆ، ناوانێکی جوگرافیایی زۆرمان بۆ هەڵئەدا وەك.

یـــــــاوای (زاوەڵــــــــی) لادێ بنــــــاڵـــــــە
تووخـوا تـەن خـوای قـادر پـەی کـۆی (قرژاڵـە)
ســــەرمیــل (کــــرند) دیـارگــــەی (رووان)
(ڕێـــزە) و (ســــارابەند) (کـــویلە)و (مــاکوان)
ســـــەوزان (لـــەیـلاخ) دیـارەن جـــــە دوور
(کـــــەلی عــــــاشقان) (زەڵـــم) و (شــارەزوور)
گـــــۆم (زرێـــــوار) ســـــارای (رازیـــــان)
کـــۆی (قــەڵاقـــازی) ملــــــەی (بازیـــــان)
(زەویـــری) پارچـــــەی (وەیـــس یەمـــەن مـــاڵ)
قولـــەی (پــیر ڕۆســـتەم) (هەیبـــەتو ســـاراڵ)
نەحیـــەی (جـــــوانڕۆ) تـــا دەشــتی (زەهـــاو)
بەنـــــــد (قـــــــەرەداخ) (ســـەرکوڕەی کــاژاو)
هـــــەر جـــــە (بێـستون) تــا وڵاتـی (کـــۆ)
هـــــای شــــەمـــاڵ یــە گـشت دیـارەن جـە تـۆ

شوێنانێکی زۆر ناو دەبا کە زیاتر لە ١٢٠ دێڕە و ناکرێ لێرەدا هەموویان بێنین، بەڵام ئەوەی کە جێگای سرنجە لەم پارچە شیعرەیدا، میرزا وەك جوگرافیازانێکی کارئامۆ ناوی زۆربەی ئەو ناوچانەمان بە شێوەیەکی ئەدەبی زۆر جوان بۆ بەیان ئەکا تا ئیدی لە بیر نەچنەوە.

لە لا یەتریشەوە شاعیرانی زۆرمان بوون کە هەورامی نەبوون، یان بۆ ماوەیە لە ناوچەکانی هەوراماندا ژیاوە و بە شێوەیەکی زۆر جوان لە سەر ئەم بوارە ئەدەبییە هەنگاویان هەڵگرتووە و لە ئاستێکی بەرزدا وەدەر کەوتوون. ئەگەرچی ئەم جۆرە شاعیرانە زۆر بوون و ناکرێ باسی هەموویان لێرەدا بکەین، بەڵام ئەتوانین دەس بنێینە سەر کەسایەتێکی بەناوبانگی ئەدەبیاتی کوردی کە ئەویش ماموٚستا مەولەوی تاڵگۆزییە.

لە سەر کەسایەتی و بابەتی ئەدەبی و نووسراوەکانی مەولەوی زۆر وتراوە و باسی زۆریش کراوە من نامەوێ لێرەدا ئەو باسانە پات کەمەوە، تەنها ئەوەندە ئەڵێین، کە مەولەوی ئەستێرەی گەشی لووتکەی ئەم بەشە ئەدەبەیە لە ئەدەبیاتی کوردیدا، ئەویش چەند وێنەیە لە شیعرەکانی.

دڵەی خەم خەیاڵ جۆش ئاوەردەوە
مەعدووم هەم هەوای (زەهاو) کەردەوە
زرنگەی سەدای ساز جەریشەی ئەعزام
کەمانچە دەستوور ماوەرۆ مەقام

یان

تا تەوانام بی شەو بێداریم کەرد
پەرێ نۆشای جام بێ قەراریم کەرد
وێت واتەن هەرکەس شەوان بێدار بۆ
مشیۆ مەست مەی بادەی مەیخار بۆ

شاعیرانێکی تری زۆرمان هەبوون کە لە هەوراماندا چوونەتە دەرەوە و لە وڵاتانی دوورو نزیك ژیاون و لە پاڵ ئەوەشدا رەوتی ئەدەبی ناوچەکەی خۆیان لە بیر نەچۆتەوە وەك، مەلا عەبدولخالق، مەلا عەبدوڵڵا، فکری، خەیاڵی، سەید بەهای شەمس قورەیشی، مەولانا خالیدی شارەزووری و... کە لێرەدا تەنها بە چەند دێڕێ

له پارچه شیعرێکی فکری که لـه جوابی خـەیاڵی دا و هەردووشـیان لـه ئەسـتەمبوڵ ئەبن بۆی دەنووسێ قەناعەت ئەکەین.

هـــا شیـــن وەراوە. ......................

خـــــەیاڵـــی یـاران هـــاشیـــن وەراوە

من مـــام چـەنی دەرد هـــەناسەی سـەردم

ئەوان شـین پـەی هـــەرد هـەوارگەی شـاوە

دمـــــای ئـەو ئـازیز شـــــۆخ بـێ گــــەردم

چتــــەور بمــــانــوو وە ڕووی دنیـــــاوە

ئەڵبەتە ئەم جۆرە شیعرەیش بە سەبکە زۆرکەم و نایاب بووە تا ئەو سەردەمە.

لێرەدا دێینە کۆتایی ئەم بەشە ئەگەرچی زۆر کورت و سەرپوتکراو باسمان کرد.

بەداخەوە نەئەکرا لەوە زیاتر لە سەری بڕۆین هەروا لە پێشدا ئاماژەم پـێ کـرد ئـەدەبی هـەورامی تـەنها تایبـەتی ناوچـەکانی هـەورامان نـەبووە و کـاتی خـۆی لـە رادەیەکی بەربلاو چ لە دوور و چ نزیـك وەك بەشـێ لـە ئـەدەبی رەسـەنی نەتـەوەیی کـەڵکیان لـێ وەرگرتـووە و زۆربەشـیان بـە شـانازییەوە باسـیان کـردووە وەك خانـای قوبادی لە سەرەتای خەسرەو و شیرینەکەیدا ئەڵێت:

راســـەن مـــــەواچان فارسی شــــــەکەرەن

کـــــوردی جـــــە فـارسی بـەڵ شـیرینتەرەن

پـــەی چێش نەدەوران ئەی دنیای بـەدکێش

مـــــەحفـووزەن هـــەرکەس بە زوبان وێش

لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێ لـە رابـردووی دوور تـا بـە ئـەمڕۆ ئەوانـەی بـە شـێوەی هەورامی پارێزەری زمان و ئـەدەبی نەتـەوەیی بـوون هـیچ کـاتێ خۆیـان بـە جیـا لـە زمان و ئەدەبی کوردی نەزانیوە و تەنها شتێکیش کە داڵغە و ختوورەی زهـنی ئـەوان بووبێ هەستی نەتەوایەتی و زمانی کوردی بووە.

لە کۆتاییدا ئەبێ ئەوەش بڵێین زۆر بابەتی تـر لـە ئـەدەبی هەورامیـدا هەیـە کـە ئـــەبوایا لێـــرەدا باســـم لەســـەر بکردبایـــا وەك بابەتـــەکانی کۆمەڵایـــەتی، میللـــی، سروشتی و... کە بەداخەوە لەبەر نەبوونی کات و زەمانێکی تایبـەتی لـەوە زیـاتر لـە سەری ناڕۆم، جێگای خۆیە کە ئەوەش بڵێم وا ئـەزانم زۆربـەی ئـازیزانیش باوەڕیـان

له سەر ئەوەیە کە ئەدەبی هەورامی بەو هەموو هەنگاوە جوانانەی لە درێژایی مێژوودا هەڵی گرتووە ئێستاش بەردەوامە و گەورەترین شانازی ئەوەی کە توانیویەتی کەلێنێ لە ئەدەبیاتی کوردیدا پڕکاتەوە و پاڵپشتێ بووە بۆ زمان و ئەدەبی نەتەوەیی.

بەشی دووهەم: جۆگرافیای سروشتی

پاش ئەوەی هەندێ لەسەر لێکدانەوەی وشەی هەورامان و جۆگرافیای ئەدەبی و کورتەباسێکی ئەدەبیاتیشمان کرد واچاکە بێینەوە سەر بابەتی سەرەکی کە باسی جۆگرافیای هەورامان و ناوچەکانی دەوروبەریەتی، لە پێش ئەوەشدا بابزانین نووسەران و ئەوانەی لەم بابەتەوە شتیان نووسیوە چیمان ئەدەن بەدەستەوە.

هەروا کە وتمان ئەم بەشە لە کوێستانی زاکرۆس بە بۆنەی سەختڵەت و ئەستەم بوونیەوەو نەبوونی کەرەسەی باشی گواستنەوەی وەك ماشین و جادەو ڕێگاوبان، زۆربەی ئەو بەڕێزانەی لە بابەتی ئەم ناوچەیەوە شتیان نووسیوە هەتا بۆ ناوی شوێنەکانی جۆگرافیایی تووشی هەڵەو ناتەواوی و نەناسراوی و ئەشکالاتی جۆربەجور بوون.

بۆ وێنە وا لێرەدا چاوێ ئەگێڕین بەو نووسراوانەی کە لەم بابەتەوە نووسراون تائەو شوێنەش کەبۆمان ڕێك کەوێت و پێی بزانین بۆ ناتەواوییەکانیشی تێ ئەکۆشین و ڕاستیان ئەکەینەوە.

لە کتێبی (کوهاوکوهنامە ئێران) جەلدی یەکەم بەنووسینی ئەندازیار (عباس جعفری) لە ناوەندی بڵاوکردنەوەی (سازمان گیتاشناسی) لە بەشی کێوی (گاوەڵ)دا لە کوێستانی شاهۆ ئەڵێت، ڕۆخانەی چۆمی گراڵ لە داوێنی باکووری ئەو کێوەدا تێ ئەپەڕێ (یانێ کێوی گاوەڵ)، پێش ڕاستکردنەوەی ئەبێ بڵێین لەو شوێنەی کە ئەو سەرچاوەیە ناوی لێ بردووە کێوێکمان بەناوی (گاوەڵ) نییە تەنها شوێنێ کە بەم ناوە ئەناسرێت هاوینە هەوارێکە لە خۆرهەڵاتی گوندی داریان دا کە دانیشتوانی گوندی هەجیج هاوینان بۆ لەوەڕ خۆری ئاژەڵ و مەڕوماڵاتیان ئەڕۆن بۆ ئەو شوێنە، کێوەکانی دەوروبەری (گاوەڵ)یش بەم ناوانەن، ئاسێلان، نور، شانشین، زاز، شنگەدۆڵ، وە قوچەڵە.

ئەگەر بێتو بەرزترین کێوی ئەو دەوروبەرەش کە ئاسێلانە بە گاوەڵ ناوی بەرین کەواش نییە ئەوا ڕۆخانەی سیروان لە باکوریەوە تێ ئەپەڕێ نە ئاوی چۆمی گراڵ، ئاوی چۆمی گراڵیش بە پاوەرو ناسراوەو ئەناسرێت نە چۆمی گراڵ،

پاوەڕۆیش لـه باشـــووری خۆرئـاوای چـەند کێـوێکی بـچووکی وەك، کۆڵـە، تەپـەوەڵ، ناناوێژە تێ ئەپەڕێ کە ئەم وردە کێوانەش لە داوێـنی باشـوورو باشووری خۆرئـاوای کێوی (زاز) دان کە ئەویش لە باشوورو باشووری خۆرئاوای ئاسێلاندایە.

هەر ئەو سەر چاوەیە لـه بەشـی کێـوی (ناناوێـژە)دا ئـەڵێت، (قلعـە ناناوێـژە) لـە خۆرهەڵاتی گوندی کۆمەدەرەدایەو ئەکەوێتە باکووری کوێستانی شاهــۆ.

لێرەشدا ئەبێ بڵێین کە (قلعەی ناناوێژە) نییەو (قوله یان لووتکەی ناناوێژە)یەو ئەکەوێتــە خۆرئـــاوای گونـــدی گۆمـــەدەرە نەخۆرهــەڵات وە لـــە بەشـــی خۆرئـــاوای کوێستانی شاهۆدایە نە باکور.

لـە بەشـی کێـوی (یـۆراش) یـان (وێـراش)دا هـەر ئـەو سەرچاوەیە نووسـیویەتی (یۆراش) بەرزترین لووتکەی دەوروبەری خۆیەتی و هەروەها بە گوندێکیش ناوی لێ بردووە، ئەوەی جێگای باسە لەو دەوروبەرەیدا هیچ گونـدێکمان بـە نـاوی (یـوراش ) نییـە تـەنها شـوێنێ کـە بـەم نـاوە ناسـراوە هاوینـە هـە وارێکـە بـەناوی (وێـراش) کەدانیشتوانی گوندی زەردۆیی و دەوروبەری باینگان هاوینان بـۆ لـەوەڕخۆری مـەڕو ماڵاتیان ئەڕۆن بۆ ئەو شـوێنە، کـە بـەرزترین لووتکـەی ئـەو ناوانـەش ئاتەشگایەکە ئەڕوانێ بەسەر بەران شاخ، گەردە، هـەواری وێـراش، گـەزەن، وە لـەڕ، ئـەو کێوانـەش ئەکەونـە باشـوور وەباشـووری خـۆر ئاوایـشاری پـاوەو بـاکوور وە بـاکووری خۆرئـاوای باینگان.

لـە بەشـی کێـوی شـاهۆدا هـەر ئـەو سەرچاوەیە نووسـیویەتی کـە شـاری پـاوە لـە داوێنی خۆرئاوای شاهۆدایەو مـەریوان لـە داوێـنی باکووریـداو کرماشـان و سـنەش لـە داوێنی باشووری و خۆرهەڵاتدان.

بۆ شـاری پـاوە تـا رادەیـە راسـتە، بـەڵام بـۆ مـەریوان و کرماشـان و سـنە، ئـەبوایا بنووسرایە، مەریوان لە باکوور، سنە لە خۆرهـەڵات و خۆرهـەڵاتی بـاکوور، کرماشـان لە خۆرهەڵاتی باشووردایە.

ئەو سێ شارەیش هیچکام لە داوێنی کوێستانی شاهۆدا نین کێوان یان کوێـستانانی تر لە نێوان شاهۆو ئەو شارانەدایە وەك کوێستانی تەخت و کۆساڵان لـەنێوان شـاهۆو مەریواندا، کوێستانی چاڵاوا و پەڕاو لە نێوان شـاهۆو کرماشـان دا، کوێـستانی کوچـك سارو ئاوییەر لە نێوان سنەو شاهۆدایە.

ئەگەر هاتوو تەواوی ئـەو کوێـستانانەش بـە بەشـێ لـە کوێـستانی گـەورەی شـاهۆ دابنێین بەراوردی درێژایی و پانتایی زۆرتر لەوەیە کە ئەو سەرچاوە هێناویەتی.

یەکێ لە نووسەرانی دەرەوە بەناوی مینورسکی لە نووسراوەیەکیدا بەناوی سنە شتانێکی سەبارەت بە جۆگرافیای ناوچەی هەورامان نووسیوە بە پێویستی ئەزانم ئاماژە بە چەند خاڵێکی ئەو نووسراوە بکەم.

بۆ پاڵنگان نووسیویەتی وا لە قەراخ یان کەناری رۆخانەی گاوەرۆدا لە باکووری کوێستانی شاهـۆدایە، هەروەها نووسیویەتی رۆخانەی سیروان تا دامێنگەی سەرووی کێوی هەورامان بەم ناوە ئەناسرێت کە لێرەدا مەبەست کوێستانی تەختە، ئەو شوێنەش کە ئەڵێت، ئەبێتە دووئاوانی ئەسپەرێز.

جێی خۆیەتی ئەوە روون کەینەوە کە پاڵنگان لە باکووری خۆرهەڵاتی شاهۆدایەو رۆخانەی گاوەرۆش تا ئەو شوێنەی وا گاوەرۆ و قشلاخ بە یەك ئەگەن بەم ناوە ناسراوە و ئەناسرێت، ئەو شوێنەش نزیك بە ٤٠ کیلۆ مەتر لە خۆرهەڵاتی باکووری پاڵنگاندایە، پاڵنگانیش لە قەراخی رۆخانەی تەنگیوەردایە کە پاش ئەوەی لە پاڵنگان ئەترازی ئەرژێتە سیروانەوە، سیروانیش لەو شوێنەی گاوەرۆ و قشلاخ بەیەك ئەگەن بەم ناوە ناسراوە نە دووئاوانی ئەسپەرێز کە ئەوەش لە بەشی رۆخانەکاندا بەباشی روونی ئەکەینەوە هەر ئەو نووسەرە لە شوێنێکی کەی نووسراوەکەیدا پاوە بە بەشێ لە جوانرۆ دائەنێ و کوێستانی شاهۆ لە کێوەکانی هەورامان جیا ئەکاتەوە ئەبێ ئەوەی بزانین کە شاهۆو کوێستانەکانی دەوروبەری بەکێوەکانی هەورامان ناسراون و لەوەدا هیچ شەك و گومان وە دوودڵی نییە.

بۆ پاوەش ئەبێ بڵێین لە درێژایی مێژووی دەسەڵاتداری هەورامییەکانا پاوەو گوندەکانی دەوروبەری لە ژێر دەسەڵاتی ئەواندا بووە، تەنها لە سەردەمی (شەرەف الملك) وە موحەمەد بەگی وەکیلی گەورەدا لەژێر دەسەڵاتی جوانرۆدا بووە.

لە کتێبی کوردو کوردستانی ئایەتوڵا مەردۆخ لە بەشی هەوراماندا ئەویش هەر وەك مینورسکی نووسیوە، هەرچەند مامۆستا مەردۆخ نووسەرێکی پایەبەرزو خۆماڵییە زۆریش باسی نووسەرانی خۆماڵی کردووە، لە لایە تریشەوە بنەڕەتی خۆی ئەچێتەوە سەر مەردۆخییەکانی هەورامان و زانیاری باشی لە مەڕ جۆگرافیای ئەم ناوچانە هەبووە کەچی بەداخەوە لە نووسەرێکی روسی پەیڕەوی کردووە، هەتا هەورامانی تەختیشی لە باشووری خۆرئاوای سنەدا داناوە.

لە بارەی هەورامانی لەهۆنەوە ئەوەمان روون کردووەتەوەو ئیدی پێویست بە دووپاتکردنەوە ناکا، بەڵام بۆ هەورامانی تەخت ئەگەر هاتو ژاوەرۆمان بە بەشێ لە هەورامانی تەخت زانی کە واش نییە، هەتا مامۆستا مەردۆخیش بە بەشێ لەوی

نازانێ ئـەوا ئـەو بۆچوونە تـا رادەیـە دروسـت بـوو، کەچـی لێـرەدا بۆمـان دەرکـەوت ناوچەی هەورامانی تەخت لە ژاوەرۆ جیایە بەس لە خۆرئاوای سنەدا دروستە.

لە کتێبی (کرماشان و شارستانیەتی کۆن) بەنووسـینی ئاغـەی ئیرەجـی ئەفشاری سیـستانی لـە بەشـی کوێـستانی شـاهۆدا ئـەویش ئـاوا ئـەڵێت (شـاری پـاوە لـە داوێـنی خۆرئـاواو مـەریوان لـە داوێـنی بـاکوورو شـارەکانی سـنەو کرماشـان لـەداوێنی خۆرهەڵاتدا، بـە جـوانی روونـە کـە ئـەمیش ئـەوەی لـە کتـێبی (کوهـا وەکوهنامـەی ئێران) وەرگرتووە کە روونکردنەوەیەکمان پێشتر لەو بابەتـەوە نووسـیووە وا ئـەزانم پێویست بە دووبارە کردنەوەی نەبێ.

هەر ئەو سەرچاوەیە لە بەشی کێوی گەزەنـدا نووسـیویەتی گـەزەن لـە بـاکووری گونـدی حـەوزە پـووچ دایـە وەڕاسـتە یـاڵی ئـەو شـاخەی بـە سـنووری نێـوان پـاوەو جـوانرۆی دانـاوە، بـە داوای لێبـوردن لـە ئاغـەی سیـستانی چـەند هەڵەیـەك لـەو بۆچوونەیدا هەیە کە پێوستە راستیان کەینەوە.

یەکەم. ئەو کێوە یانی گەزەن وە ئاتەشگایەك راستە یاڵن کە وان لە نێوان شـاری پاوەو باینگاندا باینگانیش ئەمڕۆ بەشێکە لـە ناوچـەکانی پـاوە، بـەم بۆنەیـەوە ئـەو کێـوە نـابێ بەسـنووری نێـوان جـوانڕۆو پـاوە ئـەو سـنوورەی کـە ئاغـەی سیـستانی نووسیویەتی هـەڵ ئەگەڕێتـەوە بـۆ دەورانـی دەرەبـەگی و عەشـایەری ئێمـەش باسـی جۆگرافیای ئەمڕۆ ئەکەین نەجۆگرافیای مێژوویی.

دووهەم: هیچ گوندو ئاواییەك بە ناوی حەوزەپووچ مـان لـەو دەوروبـەرەدا نییـە تەنها شوێنێ کە بەم ناوە نزیکە هاوینە هەوارێکە بـەناوی (وەزەپـووچ) کـە (وەز) لـە شێوەزمانی هەورامیدا یانێ (گوێز) وە (گوێزی پووچ) یش یانی (خاڵی یان پووچەڵ) کە بەتێکڕا ئەبێتە (گوێزی پووچەڵ) یان (گـوێزی بـێ کاکڵـە) ئـەو شـوێنەش هـەروا وتمان هاوینـە هەوارێکـە کـە دانیـشتوانی گونـدی زەردۆیـی هاوینـان بـۆ لـەوەڕخۆری مەڕوماڵاتیان ئەڕۆیشتن بۆ ئەو شوێنە، کێوی گەزەنیش لە خۆرئاوایدایە نە باکوور.

لە کتێبی جۆگرافیای ئێران بـە نووسـینی (عبـدالرزاق ئاخونـد فـەرەجی) کـە بـە کتێبی دەرسی (مرکز تربیت معلم) ناوەندی راهێنانی مامۆستایان ناسـراوە و کـەڵکی لـێ وەرگـیراوە، لـە بەشـی دوو پارێزگـای کرماشـان و کوردسـتاندا شـاخەکانی (بێـستوون) و (چلـچەمە) یـان چـل کـانی بـە بـەرزترین شـاخیان لـەو دوو پارێزگـادا دائەنێت و رۆخانەی سیروانیش لە هەردوو پارێزگادا بـە دیالـە نـاو ئـەبات و ئـەڵێت،

(ڕۆخانەی دیالە پاش تێرئاوکردنی ئەم ناوچەیە لە خاکی ئێرانەوە تێ ئەپەڕێ و ئەڕواتە خاکی ئێراقەوەو ئەڕژێتە دیجلەوە).

بۆ بەرزایی شاخەکان دەڵێن، کوێستانی شاهۆ لەو دوو کوێستانەی کە ناوی بردوون بەرزترە، ئەم کوێستانە یانێ شاهۆ لە نێوان هەردوو پارێزگادایە هەتا بەرزترین لووتکەی شاخی کە ئەبێتە (حەوزی خانی) یان (گاە قڕان) راستەیاڵەکەی بە سنووری ئەو دوو پارێزگایە ناسراوە، کەوابوو کوێستانی شاهۆ بە بەرزایی ٣٣٩٢ میتر لە کوێستانی پەڕاو بە بەرزایی ٣٣٧٢ میتر وە کوێستانی چل چەمە بە بەرزایی ٣١٧٣ میتر لە هەردوو پارێزگادا بەرزترەو بە بەرزترینیش ئەناسرێت.

بۆ ڕۆخانەی سیروانیش ئەوەمان روون کردەوەو لە بەشی ڕۆخانەکاندا باشتر لەسەری ئەڕۆین و روونی ئەکەینەوە لێرەدا تەنها ئەوەندە ئەڵێین بەداخەوە ڕۆخانەی سیروان تا بەئەمڕۆ لەم دیوی سنوور هیچ کەڵکی لێ وەرنەگیراوە ئیدی نازانم ئەم کەڵك وەرگرتنە بۆ تێرئاوکردنی زەویوزارەکان ئەویش لەو کاتەی کە ئەو کتێبە نووسراو لەکوێدایە؟

پاش ئەو لێکۆڵینەوەو لێکدانەوە دووپاتی ئەکەمەوە مەبەست لە نووسینی ئەو چەند دێڕە ئەوە نییە لە نووسەران و مامۆستایانی پایە بەرزو تێکۆشەر، چە خۆماڵی و چە غەوارە رەخنە بگرین بەڵکو هەروا کە وتمان هەر کەسێ هاتووەو ویستوویەتی لە بارەی ئەم ناوچەیەوە شتێك بنووسێت، بەو بۆنەیەوە کە باسمان کرد نەیتوانیوە دەستی بەڕاستییەکان بگات، ئێمەش بەڵێنی ئەوەمان نەداوەو نایدەین کە تەواوی ڕاستییەکانمان دەست کەوتووەو ئەیان نووسینەوە بەڵکو باوەڕم لەسەر ئەوەیە زۆر شتی کەمان لەم بارەیەوە هەیەو ماوە، منیش نەمتوانیوە راستی کەمەوە بەتایبەت ناوی شوێنەکان کەلەسەر ئەساسی خۆیان نەماون، بە هیوای ئەو ڕۆژەی بتوانین هەرچی لە واقعیەتی خۆی نێزیکە بنووسرێتەوە.

## جۆگرافیای سروشتی و کۆمەڵایەتی

ئەم بەشەی لە نووسراوەکەمان بریتییە لە جۆگرافیای سروشتی و کۆمەڵایەتی کە زیاتر لە سەر بابەتی سروشتیەکەی ئەرۆین وباسی ناوچەکانی هەورامان و دەوروبەری ئەکەین، ئەو ناوچانەش کەئەمانەوێ باسیان لەسەر بکەین ئەمانەی خوارەوەن  کە بریتین لە شەش بەش.

١- هەورامانی لەهۆن
٢- هەورامانی تەخت
٣- جوانرۆ
٤- سەلاس باوەجانی
٥- روانسەر
٦- هەورامانی خۆرئاوا یان کوردستانی ئەو دیوی سنوور (عیراق)

هەورامانی لەهۆن: کە شارو شارۆچکەکانی بریتین لە پاوە، نەوسوود، نۆدشە، باینگان، کە شاری پاوە ئەمرۆ بە ناوەندی ئەم بەشە ئەناسرێت.

هەورامانی تەخت: ئەویش چەند شارۆچکەی تێدایە وەك سەوڵ ئاوا، دزڵی، خودی هەورامانی تەخت، وەبێساران، کە سەوڵ ئاوا بە ناوەندی ئەناسرێت.

جوانرۆ: کە بریتییە لە شاری جوانرۆو بخشی شەر وێنەو گەورە دێ کانی دەوروبەری.

سەلاس باوەجانی : ئەویش لەم چەند ساڵەی دوایەدا بووە بە شارستان کە بریتییە لە شاری تازئاواو بەخشی میرئاواو گەورە دێکانی دەوروبەری.

روانسەر: ئەویش هەروەك سەلاس لەم چەند ساڵەی دوایەدا بووە بە شارستان و خودی روانسەر بە ناوەندی ناسرای و بەخشی شاهۆ کە بریتین لە گەورە دێکانی قشلاخ و مەنسورئاغایی کە بەم تازەگییە بوون بە بخشی روانسەرو بە ناوی شاهۆ دەناسرێن.

هەورامانی خۆرئاوا: کە بریتییە لە شارەکانی تەوێڵەو بیارە، وەدێهاتەکانی دەوروبەری.

ئەم ناوچانە بەتێکرا لە لایەن خۆر هەڵاتەوە، ئەگاتە نزیکی کامێران و سنووری جادەی کرماشان بە سنە، لە باکوورەوە ئەگاتە نزیکی شاری مەریوان و

شارۆچکەکانی چنارەو تێژتێژ، لە باشوورەوە ئەگاتە نزیکی مایەشت و شاری ئیسلام ئاوا یان شابادی کۆن و گەهوارەو کرندو سەرپێڵی زەهاو، لە خۆرئاواوە کە ئەبێتە خاکی کوردستانی ئەو دیو ئەگاتە ناوچەی شارەزوورو شارەکانی هەڵەبجەو پێنجوین.

لێرەدا ئەتوانین شاری پاوە بە خاڵی ناوەڕاستی ئەو ناوەندانە دیاری بکەین، کە ئەویش شوێنی جوگرافیایی و ئاووهەواو پلەی گەرماو سەرمای لە درێژایی ساڵاو ئەندازە یان (مقیاسی) پانتایی و درێژایی باکوورو خۆرهەڵاتی لە خەتی ناوەڕاستی گۆی زەویندا و بەرزایی لە ئاوی دەریا بەم جۆرەیە.

شاری پاوە لەناو دڵی یەکێ لە دەراوەکانی خۆرئاوای کۆیستانی شاهۆدایە و کەوتووەتە ١٣٠ کیلومتری باکووری خۆرئاوای شاری کرماشان و ٣٠ کیلومتری خۆرهەڵاتی رۆخانەی سیروان، کە درێژایی و پانتایی لە خەتی ناوەڕاستی گۆی زەوین (نصف النهار مبد) بەم جۆرەیە.

لە ٤٦ دەرەجەو ١٢ دەقیقەی درێژایی خۆرهەڵات وە ٣٥ دەرەجەو ٣ دەقیقەی پانتایی باکووریدا، بەرزایی لەسەر ئاوی دەریا ١٥٢٦ مترەو رادەی ئاووهەوای لە زستانا ساردو لە هاوینا زۆر گەرم نییە، کە ئەندازەی پلەی سەرمای ٢٠ تا ٣٠ ژێری سفر وەگەرمای ٣٠ تا ٣٥ لەسەر سفر، رادەی باران بارین لەم شوێنەدا لە ٨٠٠ تا ٣٠٠ میلی مترە لە درێژایی ساڵدا کە زۆرتر وەشتوواری بە شێوەی باران و لە مانگەکانی زستانا بەشێوەی بەفر ئەبارێ.

ئەتوانین لە دەسکەوتەکانی ئەم شوێنە بەشێوەی گشتی ئەمانە ناو بەرین، دانەوێڵە یان (دەغڵودان) سەردرەختی و میوەجات، کشتوکاڵ و بۆیسان، ئاژەڵداری، کەرەسەی دەستی.

ئەگەرچی هەندێ لە باسەکەی خۆمان دوور ئەکەوینەوە، کەچی پێم خۆشە کورتە باسێکی مێژوویی ئەم شارەش بکەم، کە ئەتوانێ ئاویینەیەکی باڵانما بێ بۆ تەواوی ناوچەکانی دیکەی هەورامان، هەرچەند لەبەر نەبوونی بەڵگەو نووسراوەی مێژوویی باوەڕ پێکراو زۆر تر بە لیکۆڵینەوەی مەیدانی دێتە ئەژمارەوە، کە لە پێشەکی ئەم بەشەدا هەندێ لەو کوڕو کەمیانە ئەخەینە بەرچاو، راستە باسەکەی من زیاتر لەسەر بابەتی جوگرافیایی بوو، بەڵام بۆ زیاتر ناساندنی هەورامان ئەمەش پێویستە، لەبەر ئەوەی پاوەمان بەناوەند یان خاڵی ناوەڕاستی هەورامان هێنایەوەو دەسنیشانمان کرد.

**ناوچەی پاوە لە رابردوویەکی نادیاردا ؟**

ئـەوەی کـە جێگـای بـاوەڕ و شـکنین بـێ شـاری ئـەمڕۆی پـاوە و ناوچـەی دەوروبەری چۆن بووە و چی بووە بەڵگەیـەکی ئـەوتۆمان بـە دەسـتەوە نییـە کـە بتـوانین بـە شـێوەیەکی بـاوەڕپێ کـراو لـە سـەری بـدوێین و مێـژووی ڕابـردووی کـۆن و نادیـاری ڕوون کەینـەوە، وەك زۆربـەی نووسـەران بـاوەڕم لەسەر ئەوەیە کە ڕواڵەتی بـەراوردکاری و هـەرمانی مێـژوویی ئـەبێ سـەنەد یان بەڵگەت بە دەستەوە بێ، وەگەرنە ناتوانی بەبێ ئەوان ددان بە واقعیـێتی مێژوویی هیچ میللەت و هۆز و ناوچـەیەکدا بنێیـت، ئەگـەریش بـێ جێگـای باوەڕ نییە لە بەر ئەوەی هەرجۆرە بیرو بۆچوونێکی زانـستییانە بـە تایبـەت بابەتی مێژوویی، پێویستی بە بەڵگە و سەنەدی باوەڕپێکراو هەیـە، جێگـای خۆیـەتی لێـرەدا بڵـێین بـەداخ و کەسـەرێکی زۆرەوە تـا بـە ئـەمڕۆ شـتێکی وەهامـان لـە بـەر دەسـتا نییـە، کـە بتـوانێ ڕابـردووی دێـرین و کـۆنی ئـەم ناوچەیەمان بە شێوەیەکی عیلمی و زانستی بۆ ڕوون کاتەوە.

ئەوەش نەك بەو بۆنەیەوە کە هیچ جۆرە ئاسەوار یـان بۆچـوونێکمان بـۆ بەراوردکاری دەست ناکەوێ؟ نـا، هـەم ئاسـەوار و شـوێنەوار زۆرن هـەم بـیر و بۆچوونی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە ئەتوانن پاڵپشتێ بن.

دیارە هەرمانی ئاوا پێویستی بە لێبـڕان و تێکۆشانی مەیدانی هەیە کە تـا بە ئـەمڕۆ کەسـێ لـەم بـوارەدا هـەنگاوی وای هـەڵ نـەگرتووە یـان ئەگـەریش هەڵگیرابێ تایبەت بە مێژووی سەردەمە، یان بـە دەسـت ئێمـە نەگەیـشتووەو وەك زۆرینـەی نووسـراوەکانی دی کـوردەواری لـە بـەر نـەبوونی دەسـەڵاتێکی ڕاستەوخۆی خۆماڵی لەناو چوون.

ئەوەی کە ئەڵێم ئاسەوار و شوێنەوار زۆرن ئەگەر بە چاوێکی پـشکنین و لێکۆڵەرانە سەیری پاوە و دەوروبەری بکەین ئەبینین لە هەر دۆڵ و شێو یان بەرزایی و سـەر تەپۆڵکەیـەکی چـەندەها وێنـەمان لـە بـەر چاو ئەکـەون کـە دیـارە ئەوانـەیش تـا بـە ئـەمڕۆ بـە شـێوەیەکی زانـستییانەو لـە روانگـای دێرینەناسی هەرمانیان لە سەر نەکراوە و بـۆ هـیچ کـەس ڕوون نەبووەتـەوە هی چ دەوران و سەردەمێکن.

ئەو جـۆرە هەرمانـەش پێویـستی بـە کەرەسـە و ئەسـپابانێکی تایبـەت بـە خـۆی و پـسپۆڕانێکی کارئـامۆی دێرینەناسـی و شـارەزا هەیـە، کـە بەداخـەوە

هیچ کام لەوانە ئەمڕۆ لە بەردەست ئێمەدا نین لە بەر نەبوونی ئەوانە ئێمەش نابێ هەروا بێ لایەن بین، بۆ وێنە هەندێ لەو شوێنەوارانە ناو ئەبەین.

(دەگاگا، مێردۆك، قەلای مەسناو یان قەلادزێ، قەلای میر خەسرەو یان چیای میرخەسرەو، قەلاسیا، ئاشەو گاورا یان ئاشی گاوران، قەلای پاسکە، شارای شمشیر، قەلای گەوری شیلماو، ئاتەشگا، وە چەندەها شوێنەواری بەنرخی دیکە لەم ناوچەیەدا.

لە لا یەتریشەوە بە شاهیدی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە زۆربەی ئەو شوێنەوارانە و جێگا تایبەتیانە بە شێوەیەکی دزێو و جەردەگەری هەڵکۆڵراون و چەپاو کراون، یان ئەگەر شتانێکیش دۆزراونەتەوە و ئاشکرا کراون بەداخەوە لە بەر نەبوونی بەرپرسێکی دڵسۆزو کارامە ئەوانیش هەروا پشتگوێ خراون و هیچ هەرمانێکی دێرینەناسیان لە سەر نەکراوە. بۆ وێنە ئەو کاتەی کە خەریکی دەرهێنان و تەخت و تراز کردنی جێگای ئیدارەی ئیرشادی پاوە بوون، سێ دانە کووپەی گەورەیان دۆزییەوە کە بەداخەوە نەمانزانی چییان بەسەر هات.

درووس هەر لەو ساڵەدا سێ دانە کووپەی هەر وەك ئەوانەی پاوە، لە ناوچەی نەیشابوور دۆزرانەوە کە دێرینەناسان بەراوردیان کرد هی سێ هەزار ساڵ پێش میلادی مەسیح بوون.

ئاوەهایە شوێنانی ئاوەدان کە خاوەنی دڵسۆزی هەبێ بە سێ دانە کووپە مێژووی دەڕواتەوە بۆ سێ هەزار ساڵ پێش میلاد کەچی کاربەدەستانی ناوچەی ئێمە دەیانخەنە پشت گوێ و لە ناویان ئەبەن ئیدی چ سرێکە، مەگەر خۆیان جوابی دەنەوە.

ئەگەر بە چاوێکی وردبینانە تەواشا بکرێ بۆمان دەرئەکەوێ چەندەها وێنەی ئاوا لەم ناوچەیەدا دۆزراونەتەوە کەچی پشت گوێ خراون و هەرمانی تایبەتی خۆیان لەسەر نەکراوە.

ئەوانە بە جێی خۆی بە واتەی رەوا کای کۆن بە با دان هیچ دەردێکی ئێمە دەوا ناکا، ئەوەی کە لێرەدا ئەبێ بوترێ ئێمە خۆشمان لەم بوارەدا تاوان بار و بێلایەن بووین، هەتا نە ئەوەی نەمان توانیوە لەو شتانە پارێزگاری بکەین، بۆچوونی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە کە بە شێوەی سینە

بەسینەو دەم بەدەم بە ئێمە گەیشتوون بیاننووسینەوە و هەرمانیان لەسەر بکەین هەتا لەوەی زیاتر تووشی بێلایەنی و فەرامۆشی نەبن.

ئەگەرچی هەرمانکردن بە شێوەیەکی زانستی و باوەڕپێکراو لەم بوارەدا هەروا کە وتمان پێویستی بە کەرەسە و ئەسپابی بەراوردکاری و پسپۆڕانی ئەو بەشە و ماندووبوونێکی زۆری دەوێ ئەوەش بە تاکەکەسێ ناگاتە ئەنجام و لە توانای ئێمەشدا نییە، ئەو نەبوونی ئیمکاناتەش نابێتە هۆی ئەوەی دەس لە سەر دەس نێین تا تەواوی ئەو پێداویستیانیمان دەس کەون ئەو کاتە خۆمان خەریك کەین، من بەش بە حاڵی خۆم باوەڕم لە سەر ئەوەیە کە هەر نووسەرو ڕۆشنبیرێك بە گوێرەی توانای خۆی، لە هەرکوێی ئەم گۆی زەویندا ئەژیت ئەبێ سەبارەت بە ژینگەی خۆی بێلایەن نەبێت، نابێ چاوەڕێی کەسانی تر بێت و بێن بابەتانی جۆگرافیایی و مێژوویی بۆ ڕوون کەنەوە، بە تایبەت ئێمەی کوردی بەشخوراو و تالاَنکراو.

بەم بۆنەیەوە منیش بەش بەحاڵی خۆم ماوەی چەند ساڵێکە پەیجۆری ئەو هەرمانە بووم و زۆریش گەڕاوم بە شوێنیا و لەو گەڕانەشدا بە لێکدانەوەیەکی مەیدانی و بەراوردکاری لەسەر بیروڕا و بۆچوونی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە، بە تایبەت بەساڵاچووان کە بە شێوەیەکی سینەبەسینە باسیان دەکرد هەندێ زانیاریم لەم بابەتە وەدەس کەوت، کە لەم چەند لاپەڕەیەدا دەیانخەمە سەر کاغەز، هیوادارم ڕۆژێك بێتە پێشێ کە ئەو هەلەمان بۆ بڕەخسێت و لەبەر دەستا بێت، تا بتوانین بە شێوەیەکی زانستییانە و بەراوردکاری دێرینەناسی ئەو بۆچوونانە لێك بدەینەوە و بکرێتە بناغەیەکی مێژوویی ڕاستەقینەی ئەم ناوچەیە و بکەوێتە بەردەستی لایەنگران و لێکۆڵەرانی ئەو بەشە، هەتا بەجوانی ڕوون بێتەوە کە هۆز و تیرەی هەورامی لە کەنگێوە لەم ناوچەیەدا جێگیر بوون ئیدی یەکێ بە غەیرە کورد و یەکێ بە یۆنانی و یەکێ بە...مان دانەنێت.

بۆ وێنە دوکتۆر کەمال فوئاد ئەڵێت هۆز یان تیرەی هەورامی و زازائییەکان لە سەرەتاوە کورد نەبوون و لە شوێنانی ترەوە هاتوون و لەو وڵاتەی کوردەواریدا جێگیر بوون، پاشان لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچەدا یەکیان گرتووە و بوون بە بەشێکی جیا نەبووەوە لە میللەتی کورد.

ئەگـەر لـە ڕوانگەیـەکی درێژخایـەن سـەیری بکـرێ ئێمـە نـاڵێین ئـەو بۆچوونە هەڵەیە بەڵام ئەوەی دەڵێن ئایا تـەواوی ئـەو میللەتـەی کـە ئـەمڕۆ پێی ئەوترێ کورد غەیری زازا و هەورامییەکان لە سەرەتاوە هەر کورد بوون لە وڵاتی کوردەوارییا ژیاون؟

ئەگـەر لـە ڕوانگایـەکی وردبینانـەوە سـەیرێکی ڕابـردووی کـۆنی تـەواوی کوردستان بکەین ئەوەمان بۆ دەرئەکەوێ زۆرینەی ئەو میللەتەی ئەمڕۆ بە ناوی کورد و لە وڵاتی لێك پـچڕاویی کوردەواریـدا ئـەژین و دێنـە ئـەژمارەوە زۆربەیان کۆچەر بوون و لە شوێنانی دیکـەوە هـاتوون و لـەم وڵاتـەدا جـێگیر بوون.

بە تایبەت هۆز یان تیرەی ئاریائییەکان کە لە ناوچەی بـاکوورەوە بـەناوی ئەیرین ڤاچ یان ئەیرین ڤەچ هاتوون و لە دەوروبەری زاکرۆسدا جێگیر بوون و پاشان پەرەیان سـەندووە و لەگـەڵ دانیـشتوانی کـۆنی ئـەو وڵاتـەدا یـەکیان گرتووە، کـە لـە کـاتی خۆیـدا گـەورەترین ئیمپراتوریـان دروسـت کـردووە بـە ناوی (ماد) کە زۆربەی نووسەران و مێژوونووسان بە هەندێ جیاوازییەوە لە سـەر ئـەم بـاوەڕەن، ئـەوی لـە ڕاسـتی نزیـك بـێ و مێـژووش بـە ئێمـەی ڕادەگەیـەنێ هەورامییـەکانی ئـەمڕۆ لـە تـیرەی ئاریـەن ڤاچـەکانن کـە لـە سـەرەتاوە بەشـێ لـە حکوومـەت و دەسـەڵاتی ئورارتورەکـان کـە بۆماوەیـە لـە نێوان دوو گۆمی وان و ورمیەدا خاوەن دەسەڵات بوون هاتوونەتە ئەژمارەوە.

هەندێ لـە نووسـەرانیش باوەڕیـان لەسـەر ئەوەیـە کـە بـەرەو ناوچـەکانی سنە و هـەورامان و کرماشـانی ئـەمڕۆ هـاتووە هـەروا لەپێـشدا باسمـان کـردو لێرەشدا دووپاتی ئەکەینەوە، یەکێ لە ئاوێستاناسانی سەردەم بەناوی دوکتۆر (عیمادالـدین دولـت شـاهی) لـە کتـێبی کێـوە نەناسـراوەکانی ئەوێـستا لـە خۆرئـاوای ئێرانـدا لـە سـەر ئـەم باوەڕەیـە و ئـەڵێت کـە زەردەشـت بـۆ ئـەم ناوچانە هاتووە نەك خۆرهەڵاتی ئێران ئەو هاتنەش بـە چـەند بۆچوون بـۆ خۆرئاوای ئێران جێگای باوەڕە.

یەکـەم: نزیکایـەتی و خزمایـەتی هەرواميیـەکان لەگـەڵ نیـشتەجێکانی دەوروبـەری گـۆمی ورمیـەدا کـە لـەوێوە بـەرەو هـەورامان و سـنەی ئـەمڕۆ، هاتوون.

دووهەم: وشەی هەورامان بە بۆچوونی زۆربەی نووسەران لە بنەماڵەی ئەهورائیان گیراوە یانی لایەنگرانی ئەهورامەزدا یان خوای مەزن ئەوەش دروست نەبووە مەگەر لەو سەردەمەی بە باشترین شێوە پشتیوان و پێشوازییان کردبێ لە خودی زەردەشت و ئایینەکەیان پەسەند کردووە بۆ پەرەدانیشی تێکۆشاون.

سێهەم: هەروا کە ئەزانین یەکێ لە نیشانەکانی ئایینی زەردەشتی ئاگردان یان ئاتەشکەدەیە کە ئەوانەش لە ناوچەی هەوراماندا بە زۆرینە لە بەر چاو ئەکەون بۆ وێنە ئاتەشگای پاوە، ئاتەشکەدەی بیارە و... کە ئەبوایا بۆ پاراستنی ئەو ئاتەشکەدانە لە بنەماڵەی ئەهورائییەکان کەسانێکیان پەروەردە بکردبایە کە شوێن ئەو ڕاهێنانەش لە شاری پاوە و کۆیمەکاڵی ئەمڕۆ بووە کە پاشان بە وردی باسی ئەوەش ئەکەین، پاشان هەورامییەکان لەوان جیا بوونەتەوە و بەرەو ناوچەی سنە و هەورامانی ئەمڕۆ هاتوون و لەو شوێنانەشدا نیشتەجێ بوون.

وائەزانم یەکێ لە هۆکاری نزیکایەتی هەورامی و زازائییەکان و یەکبوونی ئەوان لەو دەورانەدایە یانی سەردەمی ئورارتوورەکان کە بناغەی ئەو زبانە دەڕواتەوە سەر زبانی ئاوێستایی و فەهلەویات لەبەر هەندێ تایبەتمەندی ناوچەیی لە درێژایی مێژوودا ئەو زبانەیان پاراستووە بە تایبەت لەناوچەی هەوراماندا کەمتر ئاڵوگۆڕی بەسەرا هاتووە، ئەگەرچی ئەوەش لە خۆیدا پێویستی بە شوێنا گەڕان و لێکدانەوەیەکی زانستییانە هەیە.

یەکێ لەو باوەڕانەی کە ڕاستی ئەم بۆچوونەمان لا زیاد ئەکا ئەوەیە کە زۆربەی نووسەران و مێژوونووسان وەك (سرجان، مەسعوودی، حەمزەی ئەسفەهانی، یاقووتی، قەزوینی و مەردوخ) لە سەر ئەو باوەڕەن ئاخرین زەردەشت کە لە ناوچەی ئورمیە هاتووەتە دنیا کوڕی پورشسپ کوڕی پتریسپ کوڕی کیدرا کوڕی ئارپاك کوڕی... ئسپیتمان بووە کە لە ساڵی ١٠٠ تا ٦٦٠ی پێش میلاد ڕاگەیاندن یا زیندووکردنەوەی ئایینی زەردەشتی لە دەوروبەری گۆمی ورمیەدا دەس پێ کردووە و لەبەر ئەوەی ئەو ئایینە بۆ ماوەیە تووشی هەڵە و خورافات ئەبێ و ئەویش ئەیەوێت بیباتەوە سەر رچە و رێبازی بناغەیی خۆی لە لایەن ئەو کەسانەی بەناوی پیر یان رەهبەری

ئایینی تووشی دەردیسەر ئەبێ و بە بڕوای هەندێ لە نووسەران پاش ئەو دەردیسەرە بەرەو ناوچەی بەڵخ و خوراسان ئەڕوا و لەوێدا ئایینەکەی پەرە پێ ئەدا.

ئەو کەسانەش کە پەروەردە کراون پاشان بە ناوی رەهبەرانی ئەو ئایینە یانێ موغ ناوبانگیان دەرکردووە بێگومان ئەتوانین بڵێین یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەوەی کە هەورامییەکان دەستیان لە کۆچەری هەڵگرتووە و یەك جێنشین بوون ئەمە بووە، کە بە شێوەیەکی یەك جێنشینی و شارستانیەت ژیاون و پاشانیش کە زۆر بووەن هەرمانی باغداری و کاسبی و توجارەت و سنعەتگەری لە نێوانیاند ا پەرەی سەندووە، ئەو هەرمانانە ئێستاش لە هەوراماندا بەشێکن لە ژیانی دانیشتوانی.

بۆ ئەوەی باوەڕمان بەم بۆچوونەش هەبێ کە هەورامان ناوچەیەکی کۆن و دێرینە و لە کۆنەوە خاوەنی شارستانیەت و یەك جێنشینی بووە ئاماژە بە وتارێك دەکەین، لە لایەن ڕۆژنامەوانێ بە ناو مەنسووری ئەیازی لە ڕۆژنامەی ئیتلاعاتی ساڵی ١٣٥١ نووسراوە وتارەکە بە ناوی هەورامان کۆنترین گوندی جیهان کە لەم بارەیەوە بە شێوەیەکی زانستییانە باسی ئەوەی کردووە، کە جێگای سرنج و بە جوانی ڕوونی کردووەتەوە لە بەرچی هەورامان کۆنترین گوندی جیهانە.

بەم بۆنەیەوە ئێمە لەسەر ئەو بۆچوونەی ئاغەی دەوڵەت شاهین کە ئاخرین زەردەشت بەرەو خۆرئاوای ئێران هاتووە نەك خۆرهەڵات، ئەو جۆرە ژیانەش دانیشتوانی پاوەیشی گرتوەتەوە، کە لەو دەمەی گەورەترین شوێنی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بووە کراوە بە جێگای پەرە پێدان و ڕاهێنانی ئایینی زوردەشت یان ئەهوورایی لە بەر یەك جێنشینیش وەك تیرە و هۆزەکانی تری کوردەواری نەبوون، بۆ باری ئاژەڵداری و بەخێوکردنی مەڕوماڵات هەردەم لە شوێنێکەوە بەرەو شوێنی دی بەرێ کەون و لە بیری کۆچەڵکۆچدا بن، لە لایە تریشەوە ئاوا ئەیگێڕنەوە لە سەردەمی هێرشی ئەسکەندەری مەکدونیا (مەقدونی) ناوچەی ئەمڕۆی هەورامان پیاوێکی نەترس و بە دەسەڵاتی تێدا ئەبێ کە هێزێکی گەورە پێك دێنی و بۆ ماوەیەکی درێژخایەن پارێزگاری لەم ناوچەیە ئەکا ئەڵبەتە شێوەی جوگرافیایی ناوچەکەش یارمەتی داوە بۆ ئەو بەرەنگارییە ئەگینا ئەو

نەیتوانیوە لە بەرابەری ئەو هێزە گەورەیەدا ڕاوەستێ، ئەو بەرەنگارییەش بۆتە هۆی ئەوەی هەر هەورامییەکیان لە دەرەوەی ناوچەی هەورامانا گرتووە ڕەوانەی بەندیخانەی ئورامن لە نزیکی وان دا کردووە کە ئەو بەندیخانەش تایبەتی هەورامییەکان بووە.

پاشان لە نزیکی شاری پاوەدا پەیکەرێ لەو پیاوە نەترسە دروست ئەکەن بە ناوی مێردۆك و تا ئەم چەند ساڵەی دوایەش ئەو پەیکەرە مابوو کە بەداخەوە ئەویش بە دەستی هەندێ مرۆڤی بێلایەن و وێرانەخۆر وایان ئەزانی ژێرەکەی پڕە لە گەنج و خەزێنە لە ناویان برد، ئەگەرچی لەسەر بیرو بۆچوونی دانیشتوانی ناوچەکە کاتی خۆی وا دەیان گێڕایەوە، کە ئەو کابرایە بووە بەیەك ڕۆژ ئاڵفی ئەو ناوانی کەندوەو کاتێ گەیشتوەتە دەم یاڵو سەیری هەرمانەکەی خۆی کردوە نەی وتووە ماشەالله وتوویە وای چەند زۆرم کەندووە دەرجا بووە بە بەدر، کە هەتا ئەیانگوت هەرکەسێ دەستی لێ بدا لەشی پڕ ئەبێ لە بالۆك، ئەوانە زۆر جێگای سرنج نییەو لەباوەڕیش بەدووره تەنها ئەوانەی کە زیاتر پابەندی ئاینی بوون ویستوویانە بەم شێوەیە باوەڕی دانیشتوان بە بۆچوونە عامیانی ئاینی زیاتر بکەن، ئەڵبەتە بۆچوونێ کە هەیە لەسەر مێژووی مێردۆگ کە لە کتێبی مێژووی ماد بەنووسینی دیاکۆنف دا ئاماژەی پێکراوە، کە دەڵێت (ساڵەکانی ١١٦٥ تا ١١٥١ پێش زاینی، نبوکد نسر یان (بخت النصر) پادشای بابل پاش تێشکانی پادشای ئیلام لە کەناری ڕۆخانەی کەرخەدا ئەو ناوانە تا دەراوەکانی ڕۆخانەی دیالەو خاشمارونامار، ئەخاتە ژێردەستی خۆی، پاشان یەکێ لە سەردارانی خۆی بە ناوی (ریتی - میردۆك) کە لە بنەماڵەی (کاسی)و خەڵکی ئەو ناوچەیە ئەبێ ئەیکا بە حاکم لەو ناوانەداو تەواوی (ماڵیات و عەوارز)یان لەسەر لائەبات، ئەمە لە خۆیدا ڕووداوێکی مێژووئییەو ئەکرێت ئەو پەیکەرەش هەر لەو سەردەمەو هی ئەو سەرداره بێت، لەبەر ئەو خزمەتەی کە بەو ناوچەیە کردووە یانێ لابردنی (ماڵیات و عەوارز) کە لەو سەردەمانەدا ڕەوتێکی تایبەتی بووە لە ئیدارەکردندا، ئەو پەیکەرەیان بۆ تاشیبێت.

لەبەر ئەوەی باشتر لە ڕابردووی ئەم ناوچەیە ئاگادار بین بابەتەکەمان کورت ئەکەینەوە و دێینەوە سەر باسی چۆنیەتی شاری پاوە کە لەخۆیدا وێنەیەکی بە تەواو مانایە بۆ تەواوی ناوچەکە.

هەروا لە پێشدا ئاماژەم پێکرد ئەگەرچی هیچ جۆرە بەڵگە یان نووسراوەیەکی باوەڕپێکراو بۆ ئەو بۆچوونانە بە دەستەوە نییە بەڵام ئەوەش نابێتە هۆی بێلایەنی کە ئێمەش هەروا بیانهێڵینەوە هەتا ئەو بۆچوونانەش لە ناو بچن.

لەم بارەیەوە ئاوا ئەگێڕنەوە و بە ئێمە گەیشتووە لە زۆر کۆنەوە شاری پاوە لەو شوێنەی ئەمڕۆیدا نەبووە، بە بڕوای زۆربەی دانیشتوان بە تایبەت بەساڵاچووان، شاری پاوە لەو شوێنەیدا بووە کە پێی ئەوترێ (دەگاگا) یانێ جێگای دەگایان جێگای گوند و ئاوەدانی، کە لە باکووری شاری پاوەی ئەمڕۆدایە و بۆ کەس ڕوون نەبوەتەوە ناوی ئەو سەردەمەی چی بووە.

وای ئەگێڕنەوە (دەگاگا) شوێنێکی ئاوەدان و خاوەن ئاو و سەراوێکی جوان بووە و دانیشتوانی زۆریشی تێدا ژیاوە ئەگەر ئەم بۆچوونەش ڕاست بێ ئەکرێ ئەو دەورانە بڕواتەوە بۆ پاش دەورانی ئەشکەوتنشینی لە بەر ئەوەی لەو نیزیکانەدا ئەشکەوتانێکی زۆر هەیە بە ناوی بانەمەڕان یان مەڕان کە (مەڕ) لە شێوەی هەورامیدا یانی ئەشکەوت، زۆربەی ئەو ئەشکەوتانە ئەمڕۆش کەڵکیان لێ وەرئەگیرێت هەتا لەم چەند ساڵەی دوایەدا یەکێ لەو ئەشکەوتانەیان بە شێوەیەکی دزێو هەڵکۆڵیبوو کە نزیك بە ٨ تا ٩ میتر چووبوونە خوارەوە ئیدی نازانم شتێکیان تێدا دۆزیوەتەوە یان نا، ئەوەش لە خۆیدا جێگای داخ و کەسەرە لە باتی ئەوەی دێرینەناسان یان کاربەدەستانی ئەو بەشە بۆ ڕوونبوونەوەی مێژووی نادیاری ئەم ناوچەیە ئاوا هەنگاوێ هەڵگرن ئەبێ تاڵانکەران و وێرانخۆران ئەو شوێنانە هەڵکۆڵن و هەرچی تێدا بێ تاڵان و چەپاوی بکەن نازانین پارێزگاری ئەم شوێنانە بە ئەستۆی کێیە.

بۆچوونی کە ئەو پەیکەرەی بە ناوی مێردۆك کە باسمان کرد لەو نزیکانەداو لە خۆرهەڵاتی ئەو شوێنەدایە کە ئەوەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە یەکێ لە شوێنە نیشتەجێکانی ئەم ناوچەیە بووە، هۆی بەجێهێشتنی ئەو جێگایە وای ئەگێڕنەوە کە بوومەلەرزەیە یان (زەلزەلەیە)کی قورس لەو

ناوچەیەدا ڕووی داوە کە بە تەواوی وێرانی ئەکاو ئاو و سەراوەکەی نقرۆم و ون ئەبێ.

بۆ ئەوەی باوەڕمان بەم جۆرە ڕووداوە سروشتییانە هەبێ چەند سەدەیە لەمەو پێش لە کتێبی مێژووی کۆنی هەورامان‌دا کە نزیك بە دوو سەد ساڵ لەمەوپێش نووسراوە و بە تازەگی لە لایەن کاك ئەحمەدی نەزیرییەوە بە ناوی سەلاتینی هەورامان لە چاپ دراوە لە لاپەڕەی ٦٨ دەستنووسەکەدا ئاوا ئەڵێت (لە دەورانی دەسەڵاتی قاسم سوڵتان کوڕی عەباس قولی سوڵتان بوومەلەرزەیە بۆ ماوەی چل ڕۆژ تەواوی ئەم ناوچەیە تا تەورێز ئەگرێتەوە کە دوو گوندی نێرو مێراو بە تەواوی خاپوورو وێران ئەبن، چەند گەڕەکێ لە شاری تەورێزیش وێران ئەبێت کە یەکێ لە شاعیرانی ئەو سەردەمە بە ناوی شێخ ئەحمەدی تەختی پارچە شیعرێکی فارسی لەم بابەتەوە داناوە کە چەند دێڕێکی لەگەڵ وەرگەڕانی سادەی ئەنووسین.

بیا بنگر تو وضع این جهان را
چسان آمد زمین و زمان را
چو طاعون در هزار و صد درآمد
که خلق ازصد هزارافزون سرآمد
وقوع زلزله سال صد و هفت
بسالی ده سلیمان بیگ بیرون رفت

(واتە، وەرە سەیری کە لەو ڕووداوەی کە چون دەسیان بە یەك دا ئەرز و زەمان وەکو تاعون پاش هەزار و سەد لەناوی برد، زیاتر لە سەد هەزار کەس کاتی ڕووداوی ئەم بوومەلەرزەیە بە ساڵی ١٠٧ ئەو کاتەی کە سلێمان بەگ چووە دەرەوە) ئەڵبەتە ئەوە پارچە شیعرێکی درێژە من ئەو چەند دێڕەم نووسی کە هەم مێژووی وە هەم چۆنیەتیتی ڕووداوەکە ڕوون بێتەوە.

جێگای خۆیەتی لێرەشدا ئەوەش بڵێم، بە گوێرەی کەشکوڵێ لە مۆزەخانەی بریتانیا لە لایەن کاك ئەنوەری سوڵتانییەوە دۆزراوەتەوەو چاپکراوە کە یەکێ لە شاعیرانی ئەو کەشکۆڵەش شێخ ئەحمەدی تەختەیە کە مێژووەکەی دەچێتەوە بۆ ١٦٤٠ تا ١٧٢٠ زاینی کە بێ شك هەر ئەم شێخ ئەحمەدەیە.

ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون ئەكاتەوە ئەم جۆرە ڕووداوە سروشتییانە لە درێژایی مێژوودا لەم ناوچانەدا ڕوویان داوە و ئەكرێ باوەڕمان بەوەش هەبێ كە ئاوا بوومەلەرزەیە دەگاگای بە تەواوی وێران و نقروم كردبێ، پاش ئەو ڕووداوە ئەوانەی كە زیندوو ئەمێنێن ئەو شوێنە بە جێ دێڵن و ئەچنە دامێنی كێوە بچووك و خنجیلانەكەی كۆڵە لە كەناری دێڵێدا و بۆ ماوەیەكی درێژخایەنیش لەوێدا ئەمێننەوە.

لە بەر ئەوەی كە باوەڕمان بەم بۆچوونەش هەبێ كە ئەو شوێنەش بۆماوەیە ئاوەدان بووە، ئاماژە بە سێ شوێنەواری كۆن ئەكەین كە لەو نزیكانەدا هەیەو وادیارە هی ئەو سەردەمانە بێ، كە هەركام وێنەیەكن بۆ ئاوەدانی ئەو شوێنە.

١) شوێنەوارێك بەناوی قەلاگا یان جێگای قەلا، ئەگەرچی ئەو شوێنە تایبەتمەندی بۆ سازكردنی قەلای نییە و ئەگەریش بووبێ هی دەورانێكە سەرەتاییە یان لە شوێنێكی كەدا بووە.

٢) شوێنی دووهەم بە ناوی جەنگا یانێ مەیدانی جەنگ و شەڕ.

٣) هەر لەو شوێنەدا نزیك بە سێ سەد میتری خۆرئاوایی گۆڕستانێكی كۆن دۆزرایەوە بە ناوی (قەورو گاورا) یانێ گۆڕستانی گاوران ئەوەش شتێكی ڕوونە لە ڕوانگای موسڵمانانەوە بە نائیسلامیان وتووە گاور یان كافر ئەو سێ شوێنەوارەش بەڵگەن بۆ ئاوەدانبوونی ئەو شوێنە لە كاتی خۆیدا بۆ ماوەیەكی درێژخایەن هەتا ئەتوانین بڵێین ئەو دەورانە سەردەمی شارستانیەت و تەمەدون بووە، چونكە قەلا خۆی نیشانی شارستانیەت و لە شوێنێكیش دروست ئەكرا كە جێگای ژیانی زۆرینەی خەڵك بایا.

پاشان بە مرووری زەمان هاتوون و لەو شوێنەی كە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ گەڕەكی قەلاخوان جێگیر بوون و بناغەی شاری ئەمڕۆی پاوەیان پێك هێناوە، ئیدی ڕوون نەبوەتەوە لەو سەردەمە یان پێش ئەوە ناوی چی بووە، لەسەر ناوی قەلاخوانیش بە چەند جۆر ئەیگێڕنەوە وەك (قەلای خان، قەلای ئەخەوان، قەلای خوان و...) ئەگەر ئەو ناوانە هی پێش هاتنی ئیسلام بووبێ ئەوا ئەخەوان هەتا خانیش بە هیچ دەرئەچن لە بەر ئەوەی ئەو ناوانە هی سەردەمی پاش هاتنی ئیسلامن ئەمێنێتەوە سەر (قەلای خوان) یانێ شوێنی دروستكردنی خواردەمەنی، كە ئەوەش كاتێ دروستە چەند

قەلأو دیواخانێك لە شاری پاوە و دەوروبەریدا بووبێ کە تەنها دوو شوێن بەدی ئەکرێن لەو دەورانەدا، یەکەم (قەلأی مەسناو یان قەلأدزێ) دووهەم (قەلأی میرخەسرەو) کە بە چێە یان چیای میرخەسرەویش بەناوبانگە، ئیدی ڕوون نەبوەتەوە کە لە شاری پاوەشدا قەلأ بووە یان نا، بەلأم بەپێی چۆنیەتی جوگرافیای پاوە هیچ شوێنێکی وای لە بەرچاو ناکەوێ کە شایستەی ئەوەبێ کە بکرێ بە قەلأ، بەلأم دیواخان یان جێگای دەسەلأتی سەرۆکانی ناوچەیی شایەد هەتا بۆ خودی قەلأخوانیش لە سەر ئەو باوەڕە نیم کە شوێنی قەلأ بێت، لە بەر ئەوەی قەلأ هەردەم لە شوێنێکا دروست ئەکرا، کە لە کاتی شەڕو هێرشی دوژمنان بتوانێ بۆ ماوەیە بەرەنگاری تێدا بکرێ، ئەوەش لە ڕوانگای موهەندسی یان ئەندازیاری و بیناسازی برج و باروو دوور لە زانستێکی عیلمانییەو جێی باوەڕ نییە، ئەگەریش بووبێ تەنها جێگای دروستکردنی خوراکات و دیواخانی دەسەلأت بووە ئەگەریش جێگای دروستکردنی خوراکات بووبێ بۆ ئەو کەسانەی کە پارێزگارییان لە شاری پاوە و ئاگردانەکانی ئەو سەردەمەیان کردووە.

من بەش بەحالّی خۆم و تەنها وەك لایەنێ لەسەر ئەو بڕوایە نیم کە پێش ئەوەی ئەو جەماوەرە یانی دانیشتوانی دەوروبەری دێڵێ بێن و لە گەڕەکی قەلأخواندا جێگیر بن ئیدی کەسێ تر لەو شوێنەدا نەژیاوە، وادەزانم دوورلە روانگەی عەقلأنیەت بێت شوێنێکی وەك دەوروبەری سەرچاوەی هەوەڵی لەو دەورانەدا کەسێکی لێ نەبووبێ، من وای بۆ ئەچم ئەوانەی دەوروبەری دێڵێ هاتوون و لەگەڵ دانیشتوانی کۆنی دەوروبەری هەوڵی دا یەکیان گرتووەو پێکەوە بناغەی شاری پاوەیان داناوە، دیارە لەو سەردەمەش ناوێت ری جیا لە پاوە بە شێوەی ئەمڕۆی هەبووە، بەپێویستی ئەزانم ئەوەیش بلێم کە ئەم بۆچوونە تەنها بۆ چوونێکی تایبەت بە خۆمەو جیا لە هەندێ ئاسەواری کۆن هیچ بەلگەیە یان پشتوانییەکی زانستی بەو شێوەیەم بەدەستەوە نییە کە بیخەمە بەردەستی خوێنەرانی بەڕێز، ئاسەوارەکانیش یەکەم ئەوەی سەردەمی لێرەوپێش لە رووبەڕووی سەرچاوەی هەوەڵیدا خەریك بوون کە جێگایە بۆ موتورخانەی ئاوی هەوڵی ساز کەن لە قووڵایی نزیك بە هەشت تا دە میتردا جۆگەلە ئاوێکی دەست سازیان دۆزییەوە کە نزیك بە دە ئینچ ئاوی هەبوو، کاتێ ئەو ئاوەیان

هێنایەوە بۆ خواردنی شاری پاوە کەس نەیدەزانی کە لەپێشدا بۆ کێوە دەچێت، دووهەم هەندێ ئاسەواری ترلە ناوانی دەرەی ئاساوانا کەوتوونەتە بەرچاو کە پیشاندەری ئەوە بووە لە رابردوویەکی کۆندا جێگای نیشتەجێی دانیشتوانی ئەو ناوانە بووە.

لە بابەتی ناوی پاوەیشەوە چەند بۆچوونێك هەیە کە جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژەیەکی کورتیان پێبکەین ئیدی کامیان واقعی و دروست بێ یان نادروست ئەوە بە ئەستۆی پسپۆڕان و لێکۆڵەران و خوێنەرانی بەڕێزە.

**یەکەم**: ئەو بۆچوونەیە کە مامۆستا مەردۆخ لە مێژووی کوردستانا کە گوایا لە سەردەمی یەزدگردی سێهەم سەردارێکی بە ناوی سپەبود پاو هاتووە و بۆ ماوەیە لەم ناوچەیەدا ماوەتەوە و لەبەر ئەوەی بووەتە هۆی پەرەسەندنی دووبارەی ئاییینی زەردەشت و پێشوازی و میوانداری گەرمی دانیشتوانی ناوچەکە ناوی ئەو شوێنەیان ناوە (پاو) کە پاشان وردە وردە بووە بە پاوە کە مامۆستا مەردۆخ لەم بابەتەوە بە جوانی باسی کردووەو من لەوەی زیاتر لە سەری ناڕۆم.

دووهەم: بۆچوونی دانیشتوانی ناوچەکەیە کە بە چەند شێوە باسی لە سەر ئەکرێ کە هەرکام لە جێگای خۆیدا شایانی باس و سرنج و لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەیە.

بۆچوونی یەکەم: ئەڵێن لە (پای) گیراوە یانێ شوێنی پاك و خاوێن ئەوەش لە بابەتی سروشتی هەورامانە و چۆنیەتی ژیانی دانیشتوانی لە درێژایی مێژوودا و پاراستنی مەسائیلی شارستانیەت بەتایبەت پاکوخاوێنی بە واتەی ئەمڕۆ ئمووری بهداشتی هەروەها خاوەنی ئاییینی پاکی ئەهورائی وەرگیراوە دوور لە باوەڕ نییە.

بۆچوونی دووەم: بە مانای (پاکۆ) یانێ لە داوێنی کێودایە ئەوەش بەو بۆنەیەوە پاڵی داوە بە کێوێکی گەورەی وەك شاهۆ یان (شاەکۆ) هەروا شاکۆ لە درێژایی مێژوودا بووە بە شاهۆو، شاوە. پاکۆش بووە بە پاهۆ و پاشان پاوە.

بۆچوونی سێهەم: بە مانای (پاوە) کە ئەمەش لە خۆیدا دوو مانای هەیە یەکەم بە مانای بەسەر پێوە وەستان کە مەبەست خۆ ئیدارەکردن و موحتاجی کەس نەبوونە مانای دووەمیشی یانێ (پاگەوە) کە ئەوەش

وشـەیەکی هەورامییـە بـە مانـای لـەو شـوێنەوە وای ئەگێڕنـەوە هەنـدێ لـە دانیشتوانی پاوەیی ئەمڕۆ لەو شوێنەدا بوون کە پێی ئـەوترێ بـاخی حـاجی ئـەو شـوێنەیش بـۆ ئـەوەی دوور بـووە لـە گـەڕەکی قـەڵاخوان پێیـان گوتـووە پاگووە یانێ لەو دوورەوە، ئەڵبەت ئەو ئاماژە دوورەیش بۆ داوێنی کێو ئـەبێ نە ئاران کە ئەو دانیشتوانەیش پاشان هاتوونەتە خوارو چەند خانەوارێکیان لە (سەردێ)ی ئەمڕۆدا جێگیر بوون کە ئەو دەورانە پاوە و سـەردێ لـە یـەك جیا بوون.

بە هەرحاڵ هەر کام لـەو مانایانـەش بـووبێ ئـەبێ پـێش ئـەوەش نـاوێکی دیکەی هەبووبێ کە بە جەم بوون و هەنگاو هـەڵگرتنی دانیـشتوانی بـە پێـی ئـەو بۆچـوونانە یـەکێ لـەو ناوانـەیان پێـوە نـابێ، ئەڵبـەت لـە زۆر شـوێنی بـەیاز و دەسـخەتە کۆنـەکانیش‌دا بـە نـاوی (فـاوچ) هـاتووە کـە ئـەوەش لـە فەوجی عەرەبی گیراوە وائەزانم ئەوەش لە بـەر ئـەوەی بـووە کـە بـۆ ماوەیـە جێگای کۆکردنەوەی هێز بووە بۆ بەرنگاری لەگەڵ هێرشی عەرەبەکاندا.

ئـەوە بـوو هەنـدێ بۆچـوون لـە بابـەتی نـاوی (پـاوە)وە هـەرکام لەوانـەش بووبێ ئەمڕۆ پێی ئەوترێ پاوە و دانیشتوانیشی لە درێژایی مێژوودا لە سەر ئـایینی میتراپەرەسـتی یـان هـەتاو پەرەسـتی و زەردەشـتی و مەسـیحی و پاشانیش ئایینی پیرۆزی ئیسلام بوون.

وای ئەگێڕنەوە پێش هاتنی ئیسلام بـۆ ماوەیـەك دەسـت لـە ئـایینی کـۆنی خۆیـان یـانێ ئـایینی زەردەشـتی هەڵئـەگرن و روو ئەکەنـە ئـایینی مەسـیحی هەتا ئەو کاتەی کە سپەبود پـاو دێ بـۆ ئـەم ناوچـەیە دووبـارە دڵیـان خـۆش ئـەکا و ئەگەڕێنـەوە بـۆ سـەر ئـایینی خۆیـان و شـوێنی ئاگردانـەکانی پـاوە و ئاتەشگا دروست ئەکاتەوە و ئاگریان تێدا ڕۆشن ئەکەنەوە، ئەڵبەتـە مامۆسـتا مەردۆخ لـە مێـژووی کوردسـتاندا بەمـەش ئیـشارەی کـردووە، جێگـای خۆیـە لێرەدا ئەوەش بڵێم تا چەند دەهـە لەمـەوپێش لـە پـاوەدا گـەڕەکێ بـە نـاوی (گەڕەکەو مووسایان) یان (بلچەو مووسایان) هەبوو کـە ئـەوەش نیـشانەیەکە کە لایەنگرانی ئەو ئایینەش لەم ناوچەیەدا بوون، هەروەها لەو شـوێنەی کـە پێـی ئـەوترێ قـەڵاخوان سـێ جێگـا دیـار ئەکـەن بـۆ ئـاگری دائیمـی کـە ئـەو ئاگرانە ئەبوایا رەهبەرانی ئایینی کە پێیان ئەوترا موك یان موغ چاودێری و سەرپەرشتییان بکردبایاو مەراسیماتی ئایینی‌یان تێدا جـێبـەجێ ئـەکرد کـە

بۆ پاراستنی ئەو ئاگردانەش بە تایبەت ئەو سێ ئاگردانەی ناو شار لە بنەماڵەی دانیشتوانی ئەو سەردەمەی پاوە کەڵك وەرگرن بۆ پارێزگاری کە نەکوژرێتەوە، ئەو پارێزەرانەیش ئەبوایا نێرینە یانێ پیاو بایان، وەها ئەڵێن وشەی (ئۆجاخ کوێر) لەو دەورانەدا هاتووەتە ئاراوە، یانێ هەر ماڵێ نێرینەی نەبووە کە پارێزگاری لەو ئاگردانانە بکا ئەوا بەشە ئاگری ئەو کوژراوەتەوە و گوتوویانە ئۆجاخی کوێر بوویەوە کە ئۆجاخ یانێ ئاگردان.

وەك ئەوەی لە پێشدا گوتمان ئەم ناوچەیە لە کۆنەوە بە بنەماڵەی ئەهوورائیان ناسراوەو ئەبوایا بۆ پاراستن و پارێزگاری ئەو ئاینە یانێ ئایینی ئەهورایی شوێنێکیان بۆ کۆبوونەوەو ڕاهێنان و پەروەردەی ڕەهبەرانی ئایینی ئەو سەردەمە هەبوایا ئەوەش لەم ناوچەیەدا یانێ لە شاری پاوەدا هەبوو بەناوی (کۆیمەکاڵ) کە لە کاتی خۆیدا پێیان گوتووە (کۆی موکان یان موغان) هەروا کە باسمان کرد هەورامییەکان لە کۆنەوە یەکجێنشین بوون و لە بەر هەندێ هۆکاری سەرەکی دەستیان لە کۆچەری هەڵگرتووە و ئەوەش بۆتە هۆی ئەوەی کە بۆ هەر جۆرە هەرمانێکی کۆمەڵایەتی شوێنی تایبەتی دیاری بکرێ وەك (مەرە) بۆ جێگای مەشوەرەت و هەڵبژاردن (مەیدان) بۆ جێگای یاری و شاد و زەماون (کۆی مەکاڵیش) یان (کۆی موغان) بۆجێگای جەم بوون و پەروەردە و ڕاهێنانی ڕەهبەرانی ئایینی ئەو سەردەمە کە هەر ساڵ چەند جارێ لەو شوێنەدا کۆ بوونەتەوە بۆ چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروباری ئایینی، بەم بۆنەیەوە پێیان گوتووە (کۆی موغان) یانێ جێگای کۆبوونەوە و راهێنانی ڕەهبەرانی ئایینی، کە کۆ لێرەدا نە بەمانای چیا یان کێو بەمانای کۆمەڵ و دەستە، کە لە درێژایی مێژوودا وردەوردە کۆی موغان بووە بە کۆی مەکاڵ ئەوەش لە خۆیدا بابەتێکی زبانناسییە ئەگەرچی من ئەوەی لە خۆمدا رانابینم لە باری زمانناسییەوە باسی بکەم بەڵام وەك لایەنێ و تا ئەو شوێنەیش کە بۆم روون بوەتەوە دەیخەمە پێش چاوی لێکۆڵەرانی ئەو بەشە بەرابەری پێشەکی فەرهەنگی دێخودا لاپەڕەی ١٦ یان (تاریخی زبان و ادبیات ایران) بە نووسینی پرۆفیسۆر عەباس شوشتەری ئەڵێن لە دەورانی مادەکان و هەخامەنوشیەکاندا دوو گرووی بە دەسەڵات هەبوون بە ناوانی (موغ و بوغ) کە موغ ڕەهبەرانی

ئاییِنی بوون و بوغ کاربەدەستانی ناوچەیی کە پاشان بوغ بووە بە (بکا یان بك) کە بەگ یان بەیگ لە ئەم وشەیەوە گیراوە.

لێرەدا ئەبینین (غ) بووە بە (ك) یان (گ) و کۆی موغان بووە بە کۆی موکان وادیارە پاشان (ن) بووە بە (ل) لامیش لە زۆر شوێنی زبانی کوردیدا ئەبێ بە (ڵ) و کۆی موکانیش وردە وردە واوەکەی سواوەو بووە بە کۆی مەکاڵ بۆ ئەو لامەیش هەر ئەو سەرچاوە یانێ فەرهەنگ لوغەتی دێخودا لاپەڕەی ٢٤ ئەڵێت (و ـ ن ـ ر ـ ل) جێگای یەك دەگرنەوە بەس ئەکرێ کە نوونیش بووبێ بە (ل).

ئەڵبەت ناتوانم بێ سێ و دوو بڵێم ئەو بۆچوونە بە شێوەیەکی زانستییانە و بێ ناتەواوی لێك دراوەتەوە و هیچ جۆرە گیر و گرفتێکی تێدا نییە، ئەوە تەنها بۆچوونێکە و ڕاستی یا ناڕاستی بە زبانناسان و پسپۆڕانی ئەو بەشە ئەسپێرین، بەگوێرەی شوێنەواری ناوچەکانیش لە ڕاستییەوە نزیکە.

ژیانی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەو شێوەیە بەردەوام بووە هەتا هاتنی ئاییِنی پیرۆزی ئیسلام، بە هاتنی ئیسلامیش هەروەها بە ئاسانی خۆیان نەداوە بەدەستەوە، شەڕ و بەرەنگاری زۆر لەم ناوچەیەدا ڕووی داوە بە تایبەت لە شاری پاوەدا.

باسی ئەو شەڕو بەرەنگارییەش ئاوا ئەگێڕنەوە ئەو شوێنەی کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێ (قەڵادزێ یان قەڵای مەسناو) لەو کاتەدا قەڵا یان دژێکی گەورە و ئەستەم بووە هەتا ئەڵێن کە ئاوی چاوگەی پووینەیان لە پشتی بیمیریدا بە شێوەیەکی تایبەتی هێناوە بۆ ئەو قەڵایە، چەند کەسێ لە پیاوە بە ساڵاچووانی شاری پاوە وایان ئەگێڕاوە لە کاتی خۆیدا لە شوێنی قەڵای مەسناودا ئەگەڕاین بە شوێنی شتی بە قیمەت و کۆندا کە حەوزێکی گەورەی تێدا ئەدۆزنەوە وادیارە کە ئەو حەوزەیش بۆ جێگای ئاو بووە، ئەمەش ئەوەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە ئەبێ ئەو بۆچوونە دروست بێ یانێ هاتنی ئاوی پووینە بۆ ئەو شوێنە، بۆچوونێك کە بۆ ڕاستی ئەو ئاوە هەندێ لە باغدارانی بیمیری بەتایبەت بنەماڵەی ئاغەی خورشیدی، ئەیان گێڕایەوە لە کاتی خۆیدا هەندێ لوولەی گڵینیان لەو شوێنەدا دۆزیوەتەوە کە هی ئاوکێشان بووە بەرەو قەڵای مەسناویش کێشراون ئەوەندەیش کۆن بوون کە

ناوەکانیان جۆرە بەڵخێکی تێدا بووە، هەتا کاك رەزای خورشیدی فەرموییان مــن خــۆم یــەکێ لــەو لوولــە گڵێنانــەم بــرد بــۆ ئەســفەهان و لەزانــستگادا بەشێوەیەکی زانستی بەراوردیان کرد هی نزیك بە سێ هەزار ساڵ لەمەو پێشە بەم بۆنەیەوە ئەم باوەڕەمان زیاتر ئەبێ.

هەروا کە وتمان قەڵای مەسناو قەڵا یان دژێکی گەورە بووە و بۆ ماوەیە هێزی موسڵمانەکان نەیانتوانیوە بیگرن، هەرچەند هێرشیان بردوەتە سەری بە کوشتە و برینداریێکی زۆرەوە پاشەکشەیان کردووەتەوە، هەتا ئەوەی بە فێڵ و تەڵەکە دەیگرن.

ئــەوەیش ئــاوا ئــەبێ لــەو نزیکانــا کابرایــەك ئــەبێ کــە خــاوەنی مــەڕ و ماڵاتیکی زۆر بووە، موسڵمانەکان هەندێ مەڕ و ماڵاتی لێ ئەکرن و سەریان ئەبرن و پێستەکەیان لە بەر ئەکەن و پاشان بە خاوەنی مەڕ و ماڵاتەکە ئەڵێن، ئەبێ ئەمرۆ ئەو ئاژەڵەت بەرەو ئەو قەڵایە بەری خۆت لە دوورەوە ڕاوەستە هەرچی هاواریان لێ کردی کە ئاژەڵەکەت دوور خەرەوە جوابیان مەدەرەوە. بەو شێوە نزیك ئەبنەوە و چەند دەسەیەکیش لەو نزیکانەدا خۆیان هەشار ئەدەن کە ئاژەڵەکە نزیکی قەڵاکە ئەبێتەوە لەو کاتەدا هەرچی هاوار لە خاوەنەکەی ئەکەن کە دووریان خاتەوە خۆی ئەکا بە کەڕ، ناچار ئەبن چەند کەسێ لە نێو قەڵاکە دێنە دەرێ کە دووریان خەنەوە، هەر لەو کاتەدا ماوەیان پێ نادەن و بە یەکجاری هێرش ئەبەنە سەریان و پاش شەڕێکی زۆر قورس قەڵاکە ئەگرن و تەواوی دانیشتوانی یان ئەکوژن یان بە دیلیان ئەگرن و پاشان لە نێو شاری پاوەدا ئاگردانەکان ئەکوژێننەوە و لە کەناری ئەوانەدا مزگەوتێ بینا ئەکەن کە ئەمڕۆش بە ناوی مزگەوتی حەزرەتی عەبدوڵڵا بە ناوبانگە، کە پارچە شێعری ئاتران بەڵگەیەکی سەلمێنراوە بۆ ئەم ڕووداوە کە لەو سەردەمەیدا ئەم ناوچەیەی گرتووەتەوە.

وا ئەڵێن کە قەڵا دزی یانێ بە دزیەوە گیراوە وەگەر نە لە کۆندا قەڵای مەسناو بووە یانێ شوێنی دەسەڵات و قودرەتی ناوچەکە، پاش هاتنی ئیسلام بۆ ئەم ناوچەیە دانیشتوانی شاری پاوەش بەو شێوەیە موسڵمان ئەبن ئەگەرچی پاش ئەو ڕووداوەش یانێ سەردەمی هاتنی ئیسلام بۆ ئەم ناوچەیە تا ماوەیە درێژخایەن مێژوویەکی ڕوونمان لە بەردەستا نییە بەڵام ناو بە

ناو لە زۆر شوێندا شتانێك لەم بابەتە نووسراوانە هەیە، کە هەرکام لە جێگای خۆیدا شایانی باسکردن و لێکدانەوەیە، کە ئەگەر عومەر باقی بێ و مەشقەڵەی ژیان بمانهێڵێ ئەو هەرمانە بە شێوەیەکی تر و لە ڕوانگایەکی مێژووییەوە تا دەورانی سەردەم بنووسینەوە، من لێرەدا کۆتایی بەم بەشە دێنم، ئەوەش ئەڵێمەوە تەنها ویستم ئەو بۆچوونانەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بەرابەری ئەو شوێنەوارانەی کە هەیە لە سەر چۆنیەتی ژیانی ڕابردووەوە بیاننووسمەوە بە بەراوردێکی سەرپێیی و مەیدانی لەگەڵ ئەو شوێنەوار و ئاسەوارانەی کە هەیە هەتا لەوە زیاتر تووشی بێلایەنی و فەرامۆشی نەبن.

هیوادارم ڕۆژێ بێتە پێش هەم ئەو واتە و ڕووداوە کۆنانە بکەونە بەر لێکۆڵینەوە و ڕاستی و ناڕاستی و بە شێوەیەکی زانستییانە و ئاکادمی بەراوردکارییان لەسەر بکرێ و ئەگەر ئێمەش نەمانتوانی کەسانی دی قۆڵی زانستییانە هەڵماڵن و ببێ بە بناغەیەکی باوەڕ پێکراوی مێژوویی ئەم ناوچەیە کە بەڕاستی لەم بابەتەوە زۆر کەمدەس و بێکەس بووە.

پاش ئەو وردە زانیارییە لە بابەتی جێگاو شوێنی ناوچەکانی هەورامان و چۆنیەتی ئاووهەوای، کورتە باسێکیش لە سەر شاری پاوە ئەچینە سەر پێ ناساندنی کوێستان و شاخەکانی و شوێنی نیشتەجێی وەك شارو شارۆچکەو گوندەکان.

## کوێستانی شاهۆ

هەروا لەپێشدا وتمان هەورامان و ناوچەکانی دەوروبەری وان لە دڵی زنجیرە کوێستانی زاگرۆسی باکووریدا، بەم بۆنەیەوە زیاتر بە شێوەی بەرزایی و ئەستەم و سەخڵەت و دەراوانی قووڵ و سەرەو لێژی و سەرەو ژووری تێدا بەدی ئەکرێت، کە کوێستانی شاهۆ یەکێ لە گەورەترین و بەرزترین کوێستانەکانی ئەم ناوچانەیە و شوێنی جۆگرافیایی بەم جۆرەیە.

کوێستانی شاهۆ لە باکووری خۆرئاوایەوە، لە قەراخی ڕۆخانەی سیروان بەرەو باشووری خۆرهەڵات راکێشراوە کە تا باکووری خۆرهەڵاتی روانسەر ئەڕوات، لە لایەن خۆرئاوایشیەوە لە دوو ئاوانی هیروێ تاملە پاڵنگانەو ئەگاتەوە خۆرهەڵاتی روانسەر، کە بەتێکڕا درێژایی ئەبێتە ٥٥ کیلۆمتر وە پانتایی بە گوێرەی شوێنەکان

لـه نێـوان ١٠ تـا ١٥ کیلـۆمەترە، بـەرزترین قولـە یـان شـاخی بـە نـاوی حـەوزی خـانی ئەکەوێتـە خۆرهـەڵاتی گـەورە گونـدی شمـشێرو باکـــووری ســـەریاس و تازئـاوا، کـە بەرزاییەکـەی ئەبێتـە ٣٣٩٢ مـتر و ئـەتوانین بـە یـەکێ لـە بـەرزترین شـاخەکانی زاگرۆسی باکووری دەسنیشانی کەین.

ئـەم کوێـستانە پێـك هـاتووە لـەم کێوانـە، بـە تـەرتیپ لـە خۆرئـاواوە بـەرەو خۆرهـەڵات، ناناوێـژە، زاز، قوچـەڵە، ئاسـێڵان، شانـشین، سـێ ملـە، کـاژە، سـێ کـوڕە، چـنگەڕنە، خوشـیلك، کـوان بـەفر، رەنگـەناو، زاوڵـی، هەسـارگا، حـەوزی خـانی، هەوارەبـەرزە، هـوڵ ئـاوەر، شـێلانان، گـەردە بـەرگیر، قـەڵای گـەور، تاقـە چـەرمە، ســـەرتەپە، بەناجاڕ، سـەرکاو، مەڕەماك، سەرتەڵان، وە...........

میزانی ناوەندی پلەکانی گەرماو سەرماو وەشتوواری لـە درێـژایی ساڵا لـە نێـوان ٣٠ دەرەجە سەری سفر تا ٤٥ دەرەجە ژێری سفر میزانی وەشتی لە بەرزاییـەکان ٨٠٠ میلیمتر لە داوێنیدا ٣٠٠ تا ٦٠٠ میلیمترە لە درێژایی ساڵادا زۆربەی بەرزاییەکانی لە ژێر بەفردایەو بێژگای هاوینان هاتووچۆی پێدا ناکرێت، مەگەر بە کەرەسەو ئەکیبی شاخەوانی بە تایبەت لە زستانا.

رۆخانەی تەنگیوەر لە داوێنی خۆرهەڵاتیـەوە سەرچاوە ئـەگرێ و بـەرەو بـاکوور تـێ ئەپـەڕێ و پـاش تێپـەڕبوون لـە گونـدی پاڵنگـان ئەڕژێتـە رۆخانـەی سیروانەوە سـیروانیش لـەو شـوێنەیدا بـەرەو بـاکووری خۆرئـاوا ئـەڕواو پـاش تێپـەڕبوونی لـە ناوچەی ژاوەرۆ لە نێزیکی دووئـاوانی ئەسـپەرێزدا لەگـەڵ شاخەیکەی سیروان یـەك ئـەگرن و بـەرەو خۆرئـاوا ئـەڕواو لـە کۆتـایی ئـاخرین شـاخی ئـەم کوێـستانەدا کـە ناناوێژەیە بە تێرژانی پاوەرۆ لەم کوێستانە جیا ئەبێتەوە.

رۆخانـەی تـەنگیوەرو سـیروان لـەم شـوێنەدا، کوێـستانی شـاهۆ لـە کوێـستانەکانی کەمەرکۆ، کوچکسار، کۆساڵان، وە تەخت و داڵانی جیا ئەکاتەوە.

ئەم بەشە لە داوێنی کوێستانی شـاهـۆ چـەند گونـدێکی تێدایـە کـە لـە باشـووری خۆرهەڵاتـەوە بـەرەو بـاکوورو خۆرئـاوا ناویـان ئەبـەین، لـۆن، گازرخـانی، تـەنگیوەر، پاڵنگـان، دێوەزنـاو، دەڵـە مـەرز، ئەسـپەرێز، گیڵـوان، داریـان، وڕا، کـە زۆربـەی ئـەو گوندانە لە قەراخی رۆخانەکانی سیروان و تەنگیوەردان.

لـە بەشـی خۆرئـاوای کوێـستانی شـاهۆدا ئـاوی چـۆمی پـاوەرۆ تـێ ئـە پـەڕێ کـە لەباکووری خۆرهەڵاتی گوندی شمشێرەوە ســەرچاوە ئەگرێ و بەرەو خۆرئاوا ئەڕوا، بە تێرژانی ئاوەکانی چۆمی دووریسان و پاوە رووباری پـاوەرۆ پێـك دێـنێ و بـە نێـو

گوندەکانی خانە گاوداوێنی دەرمورو گراڵ دا بەرەو خۆر ئاوا ئەچێ و پاش تێ رژانی ئاوی چۆمەکانی نۆریاو و میرئاواو دێڵێ لە نزیکی گوندی دشـــەدا ئـاوی ئـەو ناوانـەو چاوگەی گەورەی هانەکوانی پـێ زیـاد ئـەبێ و ئـەدا بـە نێـوان کێوەکـانی تەپـەوەڵ و لـــەڕدا لـە نزیکـی گەنجگەش ئـاوی چـۆمی ساوسـان و کۆمـەدەرەی تـێ ئـەڕژێ و بـە تێپەڕبوونی لە داوێنی باشووری کێوی ناناوێژەدا لـە دووئاوانـدا ئەڕژێتـە سیروانەوە، ئەم رووبارەش لەم بەشەدا کوێستانی شـاهـۆ لە کوێستانی ئاتەشگا جیا ئەکاتەوە.

لـەم بەشـــەی داوێـــنی شـاهۆدا شـاری پـاوەو چـەند گونـــدێکی تێدایـــە کـــە لــە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا ناویان ئەبەین، گوندەکانی ،شمشێر، تازەدێ، دەرەبەیان، نۆسمە، چۆڕژی، سەرکڕان، بندەرە، دووریسان، (شاری پـاوە) خانـەگا، نۆریـاو، نجـار، کۆمەدەرە، وە گوندێکی وێران بوو بە ناوی دەرێوەر.

لە بەشی باشوور وە باشووری خۆرئاوای شاهۆ دا ئاوی چۆمی خەلیفە کە بەشێکە لە سەرچاوەی رۆخانەی لیڵـەو، لـە نیزیکـی گونـدی سـەریاس و مـەیوان دا سەرچـاوە ئەگرێ و بەرەو باشوور تێ ئەپەڕێ و بـە تێڕژانـی ئـاوی چـۆمەکانی مەنـسور ئاغـەو قشلاخ و قوڕەقەڵا لە نێزیکـی سـپی ئـاودا ئەڕژێتـە نێـو رۆخانـەی لێڵـەوە، کـە ئـاوی چۆمی خەلیفـە لـەم بەشـەدا کوێـستانی شـاهۆ لـە کێوەکـانی گەرمـەزناو و ئاوتـە کـە بەشێکن لە کوێستانی ماکوان جیا ئەکاتەوە.

لە بەشی باشوورو باشووری خۆرهەڵاتدا بەشێ لە پێدەشتی روانسەرو بەورئاوایە رووباری خەراجیان کە لە داوێنی خۆرهەڵاتی شاهۆ سەرچاوە ئەگرێ.

جادەو رێگاوبانی پاوە بە کرماشان لەم شوێنەوە تێ ئەپەڕێ، کە شارو گوندەکانی لە باشووری خۆرهەڵاتەوە بەرەو باکووری خۆرئاوا ئەمانەن، خەراجیان دێی باوکـە و گەرمەخانی، لە خۆرهەڵاتەوە بـەرەو خۆرئـاوا، (شـاری روانـســـەر) گونـدەکانی بـەور ئاوا، بناوەچ، بنچڵێ، بیاشۆش، سـەرۆی ١ و ٢، سـەڤ ئـاواو، ئـاوایی لـەیلێ، ئایـشە وەڵ، چـەمەمیران، وە شـاری (جـوانڕۆ) و خـوێڕی ئـاوا، یـارێ، کـۆرێ، بزگـۆڕە، هۆبـە، قوڕەقەڵا، شوانکارە، قەڵاگا، قشلاخ، مەنسورئاغایی، تازئاوا و سەریاس.

لە خۆرهەڵاتی شاری روانسەر ئاوی چۆمی خەراجیان ئـەم کوێستانە یـانی شـاهۆ لە کوێستانی چاڵ ئاوا جیا ئەکاتەوە، ئەڵبەت نە بەشێوەی کامڵ، لە شاری روانـسەردا سەرچاوگەی گەورەی روانسەریشی تـێ ئـەڕژێ کـە یـەکێ لـە سەرچـاوە پـڕ ئاوەکـانی تری ئەم ناوچانەیە، کـە ئـەتوانین بـە سەرچـاوەی رۆخانـەی قـەرە سـووش بێرینیـە ئەژمارەوە.

جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بەچەند شوێنەوارێکی سروشتی و دەسکرد بکەین کە لە بەرزایی و داوێنی ئەم کوێستانەدان.

لە باکووری شاری جوانڕۆدا و لەســەر ڕێگا یان جادەی کرماشان بە پاوە، دوو ئەشکەوتی تێدایە بە ناوانی، ئەشکەوتی کاوات وە ئەشکەوتی قوڕقەڵا، کە جێگایەکی خۆش و سرنجڕاکێشن، کە لەم ساڵانەی دوایەدا ئەشکەوت ناسانی کرماشان دوای تێکۆشانێکی زۆر توانییان ئەشکەوتی قوڕە قەڵا تا بەشێ لە کۆتایی بدۆزنەوەو بە گەورەترین ئەشکەوتی ئاوی خاکی ئاسیاو درێژترین ئەشکەوتی ئێران بە دنیای بناسێنن، کە ئەمڕۆ بووەتە شوێنێکی گەشتو گوزاری بۆ تەواوی ئەو کەسانەی کە سەردانی هەورامان و هەتا کوردستانی خۆرهەڵاتیش ئەکەن، ئەشکەوتی کاواتیش بە خودی خۆی جێگای سرنج و لە بابەتی سروشتییەوە یەکێ تر لە ئەشکەوتە کەم وێنەکانی ناوچەی هەورامانە، کە تا بە ئەمڕۆ بە جوانی نەناسراوەو ئاوی ئەم ئەشکەوتە براوەتەوە بۆ شاری جوانڕۆ و کەڵکی لێ وەرئەگیرێت و بەشێ لە ئاوی ئەو شارەی دابین کردووە.

لە باشووری شارە جوانەکەی روانســەردا هەڵکنراوێکی دەس دروسکەر لەنێو دڵی بەردی ئەو شوێنەدا هەڵکۆڵراوە، بەواتەی عامەی دانیشتوان بە تاقی فەرهاد ناسراوە کەچی لە رووی لێکدانەوەی کۆنینە ناسییەوە ئەم جۆرە هەڵکۆڵراوانە بە دەسکردی سەردەمی مادەکان ئەناسرێن منیش هەر لەسەر ئەو رایەم، هەروەها لەداوێنی خۆرهەڵاتی باکووری و لە دەربەندی تەنگیوەردا نووسراوەیەکی کۆن بە خەتی بزماری نووسراوەو ئەتوانین بڵێین وا لە رەدیفی نووسراوەکەی بێستوندا هەتا لە ئەویش کۆنتر کە بەداخەوە تا بە ئەمڕۆ بە شێوەیەکی کۆنینە ناسی عیلمی و زانستی هەرمانی لەسەر نەکراوە بە واتەی هەندی لە دێرینە ناسان هەڵئەگەڕێتەوە بۆ دەورانی هێرشی ئاشووریەکان بۆ سەر ناوچەکانی هەورامان و سەرزەوینی ماد.

لە بەرزترین نوختەی ئەم کوێستانەدا لە باکووری قولەی حەوزی خانی شوێنێکی سروشتی تێدایە بە ناوی پیازدۆڵ کە هەرساڵ لەو شوێنەدا پیازی لێ ئەڕوێ، کە لە کاتی جوانیدا بۆ خواردنیش کەڵکیان لێ وەرئەگیرێ هەر بەم بۆنەیەوە بە پیازدۆڵ ناوبانگی دەرکردووە و هەرساڵ لە وەرزی هاویندا گەشتیرانێکی زۆر بۆ رابواردن و گەڕان و گەشت و سەیران رووی تێ ئەکەن، کە بەیەکێ لە جوانترین سەیرانگاکانی شاهۆ دێتە ئەژمارو بەخۆشترین هاوینەهەواری ئەناسرێت، کە لە ڕابردوودا دانیشتوانی دەوروبەری شاری پاوە بەتایبەت گوندی

نۆرياو بۆ لەوەڕخۆری ئاژەڵ و مەڕوماڵاتيان ئەڕۆيشتن بۆ ئەوشوێنە، ئـەم بەشـە لـە شاهۆ بەبۆنەی بەرزايی زۆر هەر ساڵ تا ئاخری وەرزی پائيز بەفری تێدا ئـەمێنێ و لەلايە تريشەوە هەندێ چاڵە چاڵەی گەورەی تێدايە کە لەزاراوەی ناوچـەييدا پێيـان ئەوترێ قوڵکە يان نوور، زۆر لەوەی ئەچێ کە شوێنی ئاگرپژينە (ئاتەش فشان) بـن، هەروا لە پێشدا کورتە باسێکمان کرد کە يەکێ لە نووسەرانی رابـردووی کوردسـتانی ئـەم ديـو بـەناوی عـەلی ئەکبـەری وەقـايع نيگـار لـە سـاڵی ١٢٨٠ هـ. ق. لـە گەشـتێکی عيلمی بۆ سەر کوێستانی شاهۆ ئاماژەی بەمە کـردووەو دەڵێـت (لـە زۆر شـوێنی ئـەم کوێستانەدا چـاوم بەهەنـدێ بـەرد بەشـێوەی (متخلخلـەو سـنگ پـا) کـەوت لـەوەی دەچێت کە دەورانێکی کۆن ئاگرپژێن بووە ) وە هەندێ بۆچوونی کـە لـەم بارەيـەوە، ئەگەر بێتو ئەم بۆچوونەش راست بێ دوور نييە کـە وشـەی هـەورامان لـە ئاورومـان نەگيرابێ، بەڵام تابە ئەمڕۆ بـە شـێوەی زانـستی ئـەم بابەتـە تائيـد نـەکراوە ئێمـەش ناتوانين بەتەنها بۆچوونێك ددانی پێدابنێين.

لە سەر لوتکەی بەرزترين شاخی شاهۆ کـە حـەوزی خانييـە، حـەوزە چکۆلەيەك لەبەرد هەڵکۆڵراوە، بەبڕوای زۆربەی دانيشتوانی ناوچەکە دەڵێن لە سـەردەمی خـان ئەحمەد خانا بووە بۆيە ناوی نراوە حەوزی خانی، ئەڵبەتـە نـاوی کەيـشی هەيـە کـە پێی ئەوترێ گامە قڕان هەروەها شوێنەواری قەڵای پاسکەو ئاشی گـاوران لـە داوێـنی خۆرئاوای ئەم کوێستانەدا دوو ئاسەواری دێرينن.

داوێنــەکانی ئــەم کوێــستانە بێــژگای بەشــێکی کــەم لــە باشــوورو دەوروبــەری روانــسەر، تـەواوی بەشـەکانی تـری لـە ژێـر دارسـتانێکی سروشـتيدا داپۆشـراوە کـە زۆربەی دارەکانی هـەر وەك بەشـەکانی تـری زاگـرۆس، دار بـەڕوو، قـەزوان يـان وەن، گوێـژ، کێکـف، بلاڵـووك، وە....پێـك هـاتووە بەتايبـەت لـە داوێـنی باکووريـدا ئـەو دارستانە ديمەنێکی تايبەتی بەم کوێستانە بەخـشيوە، لـە شـوێنە بەرزەکانيـدا تـەنها داری ئارژنگ، گوێنو، تەڕەژی يان تەرو، وەبلاڵووکی لـێ ئـەڕوێ، ئەوانـەش بەبۆنـەی ئەوەی کە زۆربەی مانگەکانی ساڵ لەژێر بەفردان بەرزائييان زۆر کەمە.

لـە بەشـی باشـوور کـە پێدەشـتی دەوروبـەری روانـسەرەو بـە بەشـێ لـە مايەشـت ناسراوە، شوێنێکی باشە بۆ کشتووکاڵ کە زۆربـەی کـشتووکاڵی ئـەم ناوانـەش گـەنم، نۆك، جۆ، وە زەڕاتە، هـەر وەهـا لـە داوێـنی ئـەم کوێـستانەدا کانيـاو يـان سەرچـاوەی گـەورەی زۆری تێدايــە بەپێويــستی نــازانم نــاوی هــەموويان بــەرم تــەنها چــەند شوێنێکيان ناو ئەبەين وەك سەرچاوەی روانـسەر، هانـە گـوان، کـە لـە پێـشدا ناومـان

بـردن وەسەرچـاوەی پاڵنگـان کـە ئـەویش یـەکی تـر لـە گـەورە سەرچـاوەکانی ئـەم ناوانەیە و لە داوێنی گوندی پاڵنگانا ئەڕژێتە نێو ڕۆخانەی تەنگیوەر وە سیروانەوە، هەروەها لە کەناری سیروان لەو شوێنە تا گوندی داریان سەرچاوەی گەورەو پڕئـاوی زۆری تێدایــە، بـۆ وێنــە ئــەتوانین ئامــاژە بەمانــە بکــەین سەرچـاوەی دێوەزنــاو، سەرچـاوەیە لـە خۆرهـەڵاتی زۆم سەرچـاوەکانی داوێـنی ئەسـپەرێز وە سەرچـاوەی داریان.

## کوێستانی تەخت و داڵانی

کوێـستانی تـەخت و داڵانـی لـە بـاکوورو بـاکووری خۆرئـاوای شـاهۆدایە، کـە لـە قـەراخی سـیروانەوە بـەرەو بـاکوورو بـاکووری خۆرئـاوا راکـشاوەو تـا ملـە کـەوەی پێنجوێن لـە کوردسـتانی ئـەودیو دەستنیـشان ئـەکرێت، کە بەشـی کوردسـتانی ئـەم دیـوی پێـك هـاتووە لـە کێوەکـانی، دەربەنـد، سـوورێن، داڵانـی، دەرەکـی، پیرڕۆسـەم، عـەوداڵان، قـولی، مەهـدی یـان مـادی، پـسی کەمـەر، قـەڵازوان، کـەماجاڕ، داڵەمـەز، مــەوجات، تەتــە، ژاڵانــە، شەمــشی، حەوکەشــان، لــە داوێــنی شەمــشیدا کێــوانێکی بچووکتری پێوە بەسراون، وەك بیلت، پەروینێ، شنروێ لە هەورامانی ئـەودیو کـە تـا قەراخی گۆمی دەربەندیخان راکشاوە.

بەرزترین شاخی ئەم کوێستانە لووتکەی تەختـە کـە بەرزاییەکـەی ئەبێتـە ٢٩٨٠ مـیتر هـەروەها لـە سێ لاوە یـانێ لـە خۆرهـەڵات، بـاکوور، باشـوور، لـە هـەورامانی ئەمـدیوی سـنووردایەو لـە لایـەن خۆرئاوایـشەوە ئەکەوێتـە هـەورامانی ئـەو دیـوی سنوور، کە لە هەردوولاوە شارۆچکەو گوندانێکی تێدایە کە ناویان ئەبەین، لە بەشـی هەورامانی ئەمـدیوی سنوورچـەند شارۆچـکەی وەك نەوسـوود، نۆدشــە، هـەورامانی تـەخت، وە دزڵـی، لـە بەشـی ئـەودیو تەوێڵـە، بیـارە، وە شـارانێك وەك هەڵەبجـەو پێنجوێن، لە داوێنیدایە.

لە بەشی ئەمـدیو گونـدەکانی لـە خۆرهەڵاتـەوە بـۆ بـاکوور ئەمانـەن، نـاو، نـوین، کـەلجی، سـلێن، بڵبـەر، سـەروپیری یـان سـەرپیر، (هـەورامانی تـەخت) وەیـسیان، رووەوەرە، کەماڵا، بندۆڵ، دەرەکی، دەمـەیۆ، (دزڵـی) دەرەنـاخێ، نـژمار، دەگاشـێخان، ئەحمەدئاوا، سیاناو، توفڵی، بارام ئاوا.

لە بەشـی باشـوور لـە خۆرهەڵاتـەوە بـۆ خۆرئـاوا، هـەجیج، میویـە، دەرەهـەجیج، (نۆدشــە) شـەڕەکان، نـەروی، نەیـسانە، دووئـاو، شـێخان، تەشـار، وەزڵـی، (نەوسـوود)

شۆشمێ خواروو سەروو، پەروینی، قەڵاگا، لەوپەوە بەرەو باکوور بە قەراخی سنووردا گوندەکانی دزاوەر، هانەگەرمەڵە، کەیمنە، وە بێروازی تێدایە.

ڕۆخانەی سیروانی بچووك و چۆمی زرێبار لە باکوورو خۆرهەڵاتەوە ئەم کوێستانە لە کوێستانەکانی پیازە لە باکوورو خۆرئاوای سەوڵ ئاوادا و کوێستانی کۆساڵان لە خۆرهەڵاتی ئەم کوێستانە جیا ئەکاتەوە، کە سیروانی بچووك پاش یەکگرتنی لە دووئاوانی ئەسپەرێزدا لەگەڵ شاخەی سیروانی گەورەدا بەرەو باشوورو باشووری خۆرئاوای ئەم کوێستانە تێ ئەپەڕێ، کە لەو ناوانەیشدا سیروان ئەم کوێستانە لە کوێستانی گەورەی شاهۆو کوێستانەکانی ئاتەشگاو گەزەن، وە کویڵەو ماکوان، جیا ئەکاتەوە تا ئەڕژێتە نێو سەد یان بەنداوی دەربەندیخان.

لە بەشی خۆرهەڵاتی باشووری ئەم کوێستانەدا و لە کەناری ڕۆخانەی سیروان و خۆرهەڵاتی گوندی هەجیجدا کانی ئاو یان سەرچاوەی پڕ ئاو و بە جۆشی تێدایە بەناوی (بڵ) کە ئەویش بێ ئەوەی تا بەئەمڕۆ سوودێکی ئەوتۆی لێ وەرگیرابێ هەروا ئەڕژێتە نێو سیروانەوە، ئەگەرچی لەم چەند ساڵەی دوایەدا کارخانەیەکیان بۆ کەڵك وەرگرتن لەو ئاوە بەناوی ئاو مەعدەنی (بڵ) داناوە کە کارناسانی ئەم بەشە ڕادەی پاکی ئەم ئاوەیان ٩٩./ لە سەدو بەیەکی لە پاکترین ئاوەکانی جیهان داناوە، کەئەمڕۆش تەنها ١./ لە سەدی کەڵکی لێ وەرنەگیراوە.

لە بەشی هەورامانی ئەودیوی سنووردا ئەم کوێستانە ئەڕوانێت بە سەر دەشتی پڕ پیت و بەرەکەتی شارەزووردا، لەم بەشە هەر لەژووری ئاوی دەربەندیخانەوە بەرەو باکووری خۆرهەڵات تا تەوێڵەو لەوێشەوە بەرەو خۆرئاواو باکووری خۆرئاوا تا نزیکی پێنجوێن چەندە گوندو شاری تێدایە.

لەم بەشەی داوێنی ئەم کوێستانەیشدا کانیاوێکی بەجۆش و پڕ ئاوی تێدایە بە ناوی (زەڵم) کە لەخۆرهەڵاتی شارۆچکەی خۆرماڵ و کەناری گوندی ئەحمەدئاوادایە، کە زۆربەی وەرزەکانی کشتوکاڵ لە جۆگەیەکی بەناوبانگ بە ناوی دەلێن بەشێك لە دەشتی شارەزوور تێر ئاو ئەکاو بۆکشتوکاڵ کەڵکی لێ وەرئەگیرێ، زیادیەکەیشی لە وەرزەکانی زستان و بەهاردا لەگەڵ ئاوی چۆمی بیارەو خورماڵ دا یەك ئەگرن و بەرەو ئاوی دەربەندیخان ئەڕۆات.

جێگای خۆیەتی کە ئەوەش بڵێین، بەشێ لە کێوەکانی ئەم کوێستانە وەك، مووجات، دالانی، شەمشی، پەروینی و (هەزارپەز) خەتی سنووری دوو وڵاتی ئێران و ئیراق، هەورامانی ئەمدی و ئەودیو لەیەك جیا ئەکاتەوە.

لە بەشی باکووری ئەم کوێستانەدا گۆمی بەناوبانگی زرێبار دیمەنێکی جوانی بەو ناوانــە بەخــشیوەو سروشــتێکی کــەم وێنــەی پێــك هێنــاوە، هــەروەها کێوەکــانی عــەودالان و دالانــی، بــۆ هــاوین و بــەهاران بەیــەکێ لــە باشــترین ســەیرانگاکانی کوردستانە، لـەم شـوێنەدا، لەسـەر چـیای عـەودالان هـەروەك پیـازدۆلی شـاهۆ جـۆرە پیـازێکی سروشـتی لـێ ئـەڕوێت، کـە لـە کـاتی جوانیـدا بـۆ خـواردنیش کـەڵکیان لـێ وەرئەگیرێت.

لە لایە ترەوە بە بۆنەی ئەوەی کە نەوەدو نۆ پیری هـەورامان و شەخـسیەتانێکی پیرۆزی وەك کۆســـەی هەجیج و سوڵتانی ساق یـان سـوڵتان ســـەهاك و پیرشـالیاری لە نێو دڵ و داوێنی ئەم کوێستانەدایە رێزێکی تایبـەتی لای دانیـشتوانی هـەورامان و زۆربەی خەڵکی کوردستاندا هەیە.

## گوێستانی کۆسالان

کۆسالان یەکێ تر لـە کوێـستانەکانی هەورامانـە کـە ئەکەوێتـە بـاکوورو بـاکووری خۆرهـەڵاتی کوێـستانی شـاهۆ وە خۆرخـەڵاتی کوێـستانی تـەخت و دالانـی هـەروەها شاخەکانی رۆخانەی سیروانی بچووك و گەورە ئەم کوێستانە لە کوێستانانی نـاوبراو جیـا ئەکاتـەوە، لـە بەشـی باکووریـشەوە ئـاوی رۆخانـەی رەزاو یـان چـەم گـەران تـێ ئەپەڕێ، کە ئەم کوێستانە لە کوێستانی پیازە جیا ئەکاتەوە.

کۆسـالان کوێـستانێکی بـچووکە کـە پێـك هـاتووە لـە کێوەکـانی ســـەرکاو، خـودی کۆسـالان، هـەی شـوور، وە خـوڕەم ڕۆ، کـە بـەرزترین لووتکـەی شـاخی کۆسـالانە بـە بەرزایی ٢٦٨٠ میتر ئـەم کۆێـستانە لـە رووی باشـوورو خۆرئـاواوە دیمـەنێکی یـەکجار سەخت و دژواری هەیە کە هەر ئەوەش لە خۆیدا بوەتە هۆی رازاوەی سروشتی و بـە یەکێ لە ئەستەمترین شوێنەکانی هەورامان ناسراوە، بەم بۆنەیەوە گوندانێکی کەمی لە داوێندایە کە بەتەرتیب ناویان ئەبەین.

لە بەشی باشوور لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئـاواو بـاکووری خۆرئـاوا، دەل، روار، هەواس ئاوا، وەرگەویەڕ، وە ژیوار، لە بەشی باکوور لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئـاوا، مـازی بـن، دەگاگـا، رەزاو، مـەحمودئاوا، مـەلا عوسمـان، سـەرخانەگا، وە دووڕووە، لـە خۆرهەڵاتەوە لە باکوور بەرەو باشوور گوندەکانی، کەکڵی ئاوا، سەرو ماڵ، ژریـژە، وە کۆڵیـژ، کـە کوێـستانی کۆسـالان لـەم بەشـەوە پەیوەسـتە بەکوێـستانی کوچکـسارو ئاویدەرەوە.

هەروا لە بەشی کوێستانەکانی شاهۆو تەختدا وتمان دووشاخەی سیروان لە باشوورو خۆرئاواوە کۆسالان لەو کوێستانانە جیا ئەکاتەوە لە بەشی باکوورو باکووری خۆرهەڵاتیشەوە ئاوی چۆمی ڕەزاو یان چەم گەران ئەم کوێستان لە کوێستانی پیازە جیا ئەکاتەوە، لە بەشی خۆرهەڵاتیشەوە ئەم کوێستان پەیوەست ئەبێ بە کوێستانی کوچکسارەوە.

## کوێستانی ئاتەشگاو گەزەن

ئەم کوێستانە لە باشوورو باشووری خۆرئاوای شاری پاوەو لە باکوورو باکووری خۆرئاوای شارۆچکەی باینگاندایە، لەبەشی خۆرهەڵاتیەوە لە نێزیکی تاز ئاواو سەریاس دا لە کوێستانی گەورەی شاهۆ جیا ئەبێتەوە و بەرەو خۆرئاوا ڕاکشاوە، کە ڕۆخانەی سیروان دوایی پێ دێنێ و لە کوێستانی تەخت و دامێنگەی شنروێ جیای ئەکاتەوە، کە سیروان لەم بەشەدا و لە نیزیکی چۆمی بەلەبزان تا وەرامچەو چۆمی مەڕە خێڵ کە بەشی خۆرئاوای ئەم کوێستانەیە بە سنووری بەشێ تر لە هەردوو هەورامان ناسراوە، کێوەکانی ئەم کوێستانە بریتین لە کێوی بەرە، ئاتەشگا، زاغە، بەران شاخ، گەردە، چاڵەگەورە، لەڕ، زەردۆیی، بانیێ، وشکەناو، وەگۆزیل، کە بەرزترین لووتکەی ئەم کوێستانە خودی ئاتەشگایە بە بەرزایی ٢٤٦٥ میتر، ئەڵبەتە کێوی لەڕ لەم چەند ساڵەی دوایەدا کردوویانە بە کەلەقەنی.

لە دامێنگەی باکووریدا ئاوی چۆمی پاوەرۆ و شمشێر لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا تێ ئەپەڕێ، هەر وا لە بەشی کوێستانی شاهۆدا وتمان ئەم دوو کوێستانە لە یەك جیا ئەکاتەوە، لەم ناوانەیش چەند گوندێکی تێدایە کە لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا ناویان ئەبەین، نۆسمە، خانەگا، دەرموور، گراڵ، وە دشە.

لە بەشی باشوورو باشووری خۆرئاوایەوە ئاوی چۆمی باینگان و مەڕەخێڵ تێ ئەپەڕێ کە لەداوێنی کێوەکانی ئاوتەو گرمەزناو کە بەشێ لە کێوەکانی کوێستانی ماکوانن سەرچاوە ئەگرێ و بەرەو خۆرئاوا ئەڕواو لە نیزیکی وەرامچەدا ئەڕژێتە سیروانەوە ئەم ڕووبارە ئەو کوێستانە لە کوێستانی ماکوان و کوێڵە جیا ئەکاتەوە.

هەر لەو مەسیرەدا شارۆچکەی باینگان و چەند گوندێکی تێدایە کە لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا ناویان ئەبەین، مەزیی، بانە وڕێ، بلەیی، ساتیاری، شارۆچکەی (باینگان ) سپی ئاو، ڕوان یان زەردۆیی، دەودان، مەڕە خێڵ، وە وەرامچە.

لـه لایـەن خـۆر ئـاواو خۆرئـاوای باکووریـەوە کـە ڕۆخانـەی سـیروان تـێ ئەپـەڕێ دامێنگەی ئەم کوێستانە لەم بەشەدا بە شێوەیەکی جوان و کەم وێنە بە دارستانێکی زۆر داپۆشراوە کە زۆربەی دارەکانیشی داربەڕوو، مازوو، قەسـقەوان یـان وەن، کێکـف وەبلاڵوك، هەر ئەم بەشە لەم کوێستانە بەبۆنی هەوای خۆشی لـە زسـتانا، شـوێنێکی کەم وێنەیە بۆ ئاژەڵداری کە لە رابردوودا عەشـیرەتی ئێنـاخی لـەم ناوانـەدا ئـەژیان، بەداخەوە لەو رۆژەی شەڕی ئێران و ئێراق دەستی پێ کرد هیچ کەسێکی لـێ نـەماوە و هەر ساڵیش چەندەها جار ئاگر لەو دارستانەی بەر ئەبێ و بە شێوەیەکی نائاسایی ئەم گەنجینەیە وردە وردە لە ناوئەچێ، لەو ناوانەدا تەنها گوندی هـیروێ مـاوە نـاوی گوندەکانیشی جیا لە هیروێ ئەمانە بوون، تـەڵوکێ، بەلـەبزان، زیـی، هێرتـا، جـووك، مـەڕەماران، ماسـان، ژاڵـەی هۆسمـان بـەگ، ژاڵـەی رەحمـان بـەگ، ژاڵـەی قوبـاد بـەگ، وەلاتوان.

یەکێ لەو شوێنە سروشتیانەی داوێنی ئەم کوێستانە سەرچاوگەی هانە کوانـە لـە بـاکووری گونـدی دشـــەدا، کـە بەیـەکێ تـر لـە گـەورە کانیاوەکـانی هـەورامان دێتـە ئەژمارەوەو، بە داخـەوە ئـەویش تـا بەئـەمڕۆ بـەو شـێوەیە کـەڵکی لـێ وەرنـەگیراوە، تەنها ئەوەی نەبێ لە هاوینان هەندێ لە دانیشتوانی ناوچەکە لەبەر گەرما رووی تێ ئەکەن، یەکێ تر لەو شوێنەوارە دێرینانەی (ئاتەشگایە) کـە لـە بـەرزترین لووتکـەی ئـەم کوێـستانەدایە و بەگـەورەترین ئاتەشـگای پـێش ئیـسلام لـە خۆرئـاوای ئێرانـا ناسراوە، لەکاتی خۆیدا ئاتەشکەدەی فەسڵی بووەو زیاتر بـۆ ئاگـاداری و مەراسـیماتی وەك جەژن و رووداوەکانی ساڵ کەڵکی لێ وەرگیراوە.

## گوێستانی ماکوان

یەکێ تـر لـە کوێـستانەکانی ئـەم ناوانـە کوێـستانی ماکوانـە کـە لـە خۆرهـەڵات و بـاکوورو باشـووری خۆرئـاوای شارۆچـکەی باینگـان و بـاکوورو بـاکووری خۆرئـاوای جوانرۆدایە، ئەم کوێستانە کە پێك هـاتووە لـە دوو بـەش مـاکوانی گـەورەو مـاکوانی بچووك، کە ماکوانی بـچووك سـەر بـە کوێـستانی رەش یـان (سـیا)یـە و لەوێـدا باسـی ئەکەین، ماکوانی گەورەیش پێك هاتووە لە کێوەکانی گەرمەزناو، راگاە، ئاوتە، شـەش دۆڵ، بل هەیس، ماکوان کویلە وە سەروەران، کە بـەرزترین لووتکـەی ئـەم کوێـستانە خودی ماکوانە بە بەرزایی ٢٦٣٠ میتر، چۆنیەتی ئەم کوێستانە لە خۆرهەڵاتـەوەو لـە نزیکی گونـدەکانی نۆخـان و لـۆراوایی دا کـە وان لـە کـەناری چـۆمی خەلیفـەو قـوڕە

قەڵادا، دەس پێ ئەکاو بەرەو خۆرئاوا راکشاوە تا کەناری رۆخانەی سیروان و ئاوی دەربەندیخان ئەڕوا، کە ئاوی سیروان لەم بەشەدا ئەم کوێستانە لە دامێنگەی شنرویێ سەر بە کوێستانی تەخت جیا ئەکاتەوە.

لە باکووریەوە ئاوی چۆمی باینگان و مەڕەخێڵ تێ ئەپەڕێ کە لە بەشی کوێستانی ئاتەشگادا بەوردی باسمان کردو دووپاتی ناکەینەوە، ناوی گوندەکانی بەشی باشوورو خۆرئاوای لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا لە داوێنی ئەم کوێستانە دان ناویان ئەبەین، بانە وڕێ، لارانی ١ وە ٢ مەڕەسان، سپی ئاو، لەشکرگە، دەگاسیا، هەنجیرکی ئێناخی، هەنجیرکی زەردۆیی، گوڕی گەور، سیمان، بەورۆڵ، دڕۆڵە، وە دەگاگا.

لە لای خۆرهەڵاتەوە ئاوی چۆمی خەلیفە تێ ئەپەڕێ کە لە بەشی کوێستانی شاهۆدا باسی ئەویشمان کرد تەنها بە ناوبردنی چەند گوندێ لەم بەشەی داوێنی ئەم کوێستانەدا پەسەندە ئەکەین، کە ئەویش لە باکووری خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرهەڵات ئاوایە کە ناویان ئەبەین، مەیوان، چلانێ ١ و ٢، لۆراوایی، سپی وەر، ئەم بەشە لەم کوێستانە کە پەیوەست ئەبێ بە کوێستانی شاهۆوە زستانانی زۆر ساردو سەخلەتە جاربەجاریش ئەوەندە بەفری لێ ئەبارێ کە ڕێگای پاوە بە کرماشان هاتوچۆی نامێنی وە یان دووچاری موشکل ئەبن، کە لە رابردوودا بەگرێوە ناوبانگی دەرکردبوو، بەڵام لەوەرزەکانی تردا بەتایبەت لە بەهارا بەیەکێ لە جوانترین شوێنەکانی هەورامان ناسراوە، هەتا لە رابردوودا بە یەکێ لە هاوینەهەوارەکانی ئەهاتە ئەژمارەوە بۆ ئاژەڵداری و ماڵات بەخێوکردن، ئەوەش لە کاتی خۆیدا زۆرتر بە هاوینە هەواری عەشیرەتی ئیمامی ئەناسرا، بە داخەوە ئەوانیش پاش شۆڕشی ئیسلامی و شەڕی ئێران و ئێراق دەستیان لە گەرمیان و کوێستان هەڵگرت و زۆربەیان لە گوندی بانە وڕێ و شارە کانی باینگان و پاوە دا جێ نشین بوون.

یەکێ لەو شتانە کە جێگای خۆیەتی لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین، شوێنێکی دەسکردی ئەم ناوچەیە کە بە دەستی کەڵە پیاوێکی کەم ئەندام بە ناوی خاڵە حسێنی ئیمامی لە هاوینە هەواری مەیگۆڕێدایە، کە لە نێو دڵی بەردی ئەم کوێستانەدا چەند خانوویەکی تاشیون و بەفەرهادی دووەمیش ناوبانگی دەرکردووە.

لە بەشی باشووری ئەم کوێستانەدا ئاوی رۆخانەی لێڵە تێ ئەپەڕێ کە بەشێکی لە خۆرهەڵاتی ئەم کوێستانەو دامێنگەی شاهۆدا سەرچاوە ئەگرێ و پاش یەکگرتنی لە خۆرئاوای شاری جوانرۆدا بەرەو خۆرئاوا ئەڕواو لەنزیکی کانی سالارا ئەڕژێتە

نێو سیروان و دەربەندیخانەوە، ئەم رۆخانەیە یانێ لێڵە ئەم کوێستانە لە کوێستانی رەش (سیا) و ماکوانی بچووك جیا ئەکاتەوە هەر لەم مەسیرەدا چەند گوندێکی تێدایە لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا ناویان ئەبەین، سپی وەر، بێوەنی ١ و ٢ کوێڵە، کلاشی هەوش، کلاشی باخان، کوا، مزران، میراولی ١ و ٢، بنجـــۆ، قــەلاجێ، دۆڵەتا، دەرەیاو، پسەخۆر، کۆســـە، دڕۆڵەی ١ و ٢، وە دارەڕەش.

بەشــێکی هـــــــەرە زۆری ئــەم کوێــستانە لــەژێر دارســـتانێکی چـــــــڕوپڕدا داپۆشـــراوە هەتا لەبڕێ شوێنیدا هاتوچۆی تێدا ناکرێت وە یان ئەگەریش بکرێت بە ئەستەم زۆربەی دارەکانیشی هەر وەکو کوێستانەکانی کەی زاگرۆس لە داربەڕوو مازوو قەسقەوان و کێکف و بلاڵوك پێك هاتووە.

## کوێستانی بازان

ئەم کوێستانە بەیەکێ لە نزمترین کوێستانەکانی ناوچەی جوانڕۆ و روانسەر دێتە ئەژمارەوە، وادەزانم هۆی نزمیشی ئەمانە بێت، یەکەم کەوتوەتە دامێنگەی زاگرۆسەوە، دووهەم لە سێ لایشەوە دەشتی پان و بەرینی مایەشت گەمارۆی داوە، شوێنی جۆگرافیایی ئەم کوێستانە بەم شێوەیە، ئەکەویتە خۆرئاوای روانسەرو دەوڵەت ئاواو باشووری خۆرئاوای جوانڕۆ و باکووری تەنگی ئەژدەها.

بەشێ لە رۆخانەکانی لێڵە و زمکان و گەڕاو لە داوێنی ئەم کوێستانە سەرچاوە ئەگرن کێوەکانیشی بریتین لە بەنی گاز یان بەنی گەز، هەنجیر، دزان، وەبازان، کە بەرزترینیشیان خودی بەنی گەزە بە بەرزایی ٢٢٤٢ میتر.

رێگای هاتوچۆی جوانڕۆ بە گۆزەران لە باکوورو خۆرهەڵات وەجوانڕۆ بە قوڵقوڵەو تازئاوا لە باکووری خۆرئاواو خۆرئاواوە تێ ئەپەڕێ.

لە لایەن باشوورەوە کە پەیوەست ئەبێ بە ناوچەکانی گەهوارە و رێژاوەو، کە ئەگەر دابەشکردنی جۆگرافیایی نەبایا ئەمان توانی ناوچەی رێژاویش بە بەشێ لە هەورامان بزانین، لە بەر ئەوەی ئەو ناو ئەو مەڵبەندەش تا چەند ساڵێ لەمەوپێش بەشێوەی هەورامی ئەدوان ئێستاش زۆربەی بەساڵاچوانیان هەر بەهەورامی ئەدوێن.

هەروەها ئەم کوێستان لە کێوی هەنجیرە لە لایەن باشوورەوە بەوەسیلەی رۆخانەی زمکان لە کێوەکانی نواڵە، نسار، وەبەردەرەش، جیا ئەبێتەوە کە ئەوانیش بەشێکن لە کێوەکانی باکوورو خۆرهەڵاتی کرند، لەو ناوانەدا گوندانێکی زۆر لەداوێن و ناودڵی ئەم کوێستانەدان کە بەناوی هەندێکیان قەناعەت ئەکەین، وەك

کەچەڵ ئاوا، تەپان، بانی بی، زمکان، نەیرێژ، حلول، دەرەمزان، باواکۆسە، تەنگی ئەژدەها، چراخان، دێی هەواس، فەلادێ، بازان، ، پشتەنگی شایگانی، حاجی ئاوا، ماخۆشین، وە قەڵا سپی.

لە لایەن خۆرهەڵاتەوە لە باکوور بەرەو باشوور، عەلی ئاوا، مامنان، گەڕاو، دەوڵەت ئاوا شەش بی، نەهراو، خانم ئاوا، تەم تەم، بان شەلە، کانی کوچکینە، مسکین ئاوا، خانلەیلێ، بەگشتر، کانی پاشا، حەسەن ئاوای گرە، ئەڵبەتە هەندێ لەم گوندانەش لە نێو دڵی ئەم کوێستانەدان.

لە بەشی باکووری خۆرئاواو خۆرئاواوە کە ڕێگای هاتوچۆی جوانڕۆ بە تازئاوای سەلاسە، قادرئاوا، کانی کەوە، بان کەڵەکان، بگاری خێڵ، بانی میران، ماساندەرە، بەردی زەنجیر، چەمەڕۆ، وە هەمرۆپاراو، وە شارۆچکەی میرئاوا، لە بەشێکی ئەم شوێنەدا ئاوی چۆمی زمکان تێ دەپەڕێ کە بوەتە هۆی جیابوونەوەی ئەم کوێستانە لە کوێستانی سیاونەهین یان ماکوانی بچووك.

## کوێستانی سیاوە نەهێن

یەکێ ترلە کوێستانەکانی ئەم ناوانە کوێستانی سیاوە نەهێنە، کە لە هەر لایەکەوە بەناوێ ئەناسرێت و ناوی ئەبەن، وەك سیاوەنەهێن، ماکوانی بچووك، کەڵەخانی، وە ساراوەن، کە سیاونەهێن دروسترەو ئێمەیش لێرەدا تەنها بە سیا ناوی دەبەین.

شوێنی جوگرافیایی ئەم کوێستانە لە خۆرئاوای جوانڕۆو باکوورو باکووری خۆرئاوای قوڵقوڵەو تازئاوای سەلاس دایە، کە بەتێکڕا پێك هاتووە لە کێوەکانی، ملەوەز، شێرچیا، ساراوەن، خڕێوە، کێشی بان، بێزڵ، باوا شاوەیس، تلەیج، کەشە سوور، بەورە چاڵ، کەشەکۆ، گەڵەخانی، خودی سیاونەهێن، ماکوانی بچووك، بێزڵ، کە بەرزترین لووتکەی شاخی کەشەکۆیە بە بەرزایی ٢٥٣٩ میتر.

دوو ڕۆخانەی بەناوبانگی ئەم ناوچەیە لە باشوورو باکووری ئەم کوێستاندا تێ ئەپەڕن بە ناوانی لێڵە وە زمکان، کە ڕۆخانەی لێڵە لە بەشی باکووری ئەم کوێستانە لە کوێستانی کوێڵەو ماکوانی گەورە جیا ئەکاتەوە، کە لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا تێ ئەپەڕێ و لە نزیکی دەربەندیخانا ئەڕژێتە نێو سیروانەوە، کە بەشێ لەم کوێستانە بە ناوی بێزڵ کەوتوەتە کوردستانی ئەودیوی سنوور.

هەر لەو مەسیرەدا چەند گوندێکی تێدایە هەر لە خۆرهەڵاتەوە بەرەو خۆرئاوا ناویان ئەبەین، عەلی ئاوا، دێ توو، دێی سەید مراد، لاسیاو، بێوڵە، سوورەوان، وێران، هەشت پشۆڵە، هاوەڵان، لۆلم، یان کلاشی لۆلم، مەڕتا، ئیمان، کلور، وە کانی سالار.

لە لایەن خۆرهەڵاتەوە بەرەو باشوور کە شوێنی جادەی هاتوچۆی جوانڕۆ بە تازئاوای سەلاسە، گوندەکانی شەروینە، زلان، چەمە نزار، دەکەونە بەرچاو.

لە لایەن باشوورو باشووری خۆرئاواوە کە شوێنی تێپەڕبوونی رۆخانەی زمکانە و بەشێکی بەدۆڵی دەرە ناوبانگە ئەم گوندانەی تێدایە، گەناو، سەرسنام، هەوراز، مەلاتولات، کرێشە، تەڵە توو، سکۆ، جەنگە، چواردیوار، پشت هەنار، خوڕێن، سوورئاو، هماجگە، بەشی ناوخاس، جیو، بانی نار، گەزنە.

ئەم کوێستانەش وەك بەشەکانی تری زنجیرە کوێستانی زاگرۆسی باکووری بە دارستانێکی چڕوپڕ داپۆشراوەو بۆ ئاژەڵداری شوێنێکی پڕ بایخە.

## کوێستانی دەری

لە ناوچەی سەلاسە باوەجانیدا کوێستانی کەمان هەیە بەناوی دەری کە شوێنی جۆگرافیایی بریتییە لە باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی شاری تازئاواو خۆرهەڵاتی ئەزگڵە، کە پێك هاتووە لە کێوەکانی، دەری، قەجەر، گرولێ، کەلی زەرد، باوا شاوەیسی خۆرئاوایی، کەلی زەرد ملە سەراژێن، وەخاتوون گەرە.

لە بەشی خۆرئاواوە بە وەسیلەی کێوی شیفلە بە کێوەکانی گاوڕا، پاڵانە، وە گاریەوە پەیوەست ئەبێ بە کوێستانی داڵەهۆوە کە بەشی زۆرینەی سەر بە شارستانی کرندە.

بەرزترین لووتکەی شاخی ئەم کوێستانەش خودی دەرییە، بە بەرزایی ١٨٥٠ میتر کە ئەمیش بەبۆنەی جێگیربوونی لە بەشی خۆرئاوای زاگرۆس بە یەکێ تر لە نزمترین کوێستانەکان دێتە ئەژمارەوە.

هەروەها ئەتوانین بە بەشێ لە سەرچاوەی ئاوەکانی رۆخانەی زمکان وە چۆمی زریسك یان زریشك بیناسین کە لە دەراوەکانی چۆمی دەشت، دەشتی وڕ، لیما، ئاوگرد، وەقاسمیان، ئەڕژێنە ئەو رۆخانانەوە، کە ئەوانیش بە باکوورو باشووری ئەم کوێستانەدا تێ ئەپەڕێ و لە نیزیکی بانی ناردا یەك ئەگرنەوە، کە رۆخانەی زمکان لە خۆرهوڵات وباکووری خۆرهەڵاتی ئەم کوێستانەدا تێ ئەپەڕێ و بەرەو خۆرئاوا ئەڕوا و پاش یەکگرتنیان لەگەڵ چۆمی زریسك بەرەو کوردستانی ئەودیو ئەچن و

ئەرژێتە ئاوی دەربەندیخانەوە، لەم بەشەدا ئەو رۆخانە ئەم کوێستانە لـە کوێـستانی سـیاو نـەهێن جیـا ئەکاتـەوە، لەبـەر ئاسـتی نزمبـوونی لـە کوێـستانەکانی تـر ئـاوو هەوایەکی نیسپی باشی هەیە بە تایبەت لە زسـتانا، بـەم بۆنەیـەوە گونـدی زۆری لـە داوێن و نێو دڵیدایە کە ناوی هەندێکیان ئەبەین.

لە داوێنی باشووریدا شاری تازئاوایە کە تاکە شاری ئەم ناوانەیەو یـەکێ لـە شـارە تـازە بـەدیهاتووەکانی هەورامانــە دیمــەنێکی جـوانی بـەو ناوچـەیە بەخـشیوەو بـە ناوەندی سەلاسە باوەجـانیش ناسـراوە، کـە لـە پێـشدا بـەناوی دەشـتی وڕ بـەناوبانگ بووە، کە دێڕە شیعرێکی فۆلکلۆری هەیە وادیـارە هـی دوو دڵـدار بـوون لـەم ناوانـەدا، کە بۆ کەس روون نەبوەتەوە کێ بوون ئەویش دێڕە شیعرەکەیە کە دەڵێت.

ســـــەر ســــەوزو بـۆر چـین لـە دەشـتی وڕدا
سەر سەوز بۆ بۆرچین خۆی ژەنـد بـە قـوڕدا

دیـارە ئـەم ناوچـەیە لـە رابردەویـەکی کۆنـدا جێگـای ئـاوەدان بـووە و سـازکردنی شاری ئەمڕۆی تاز ئاوا لە سەر ئەو ئەساسە کۆنەیە.

بەهەرحاڵ گوندەکانی وەك هەمرۆ پاراو، قوڵقوڵە، کانی دانیال، مەرەزەجاڕ، دانی سوور یان ئاوەسوور، تەمەرخان، بانی نار، کتکە، زەڵمەسوور، ئەولاّبەگ، بویسان ئاوا، نیـسکەجار، وانیـسان یـان وانـی سـەر، تاکانــە، سـێ تـەپان، هـەنجیرك، چـواردیوار، هەڕەمیان، کیسەڵ، بانی هوو، دێی شێخ، قاڵیچە، شێخ سێلە، حەوت کانی، چقاماران، عەودالان، قوبادی وە ئەزگڵە کە لەنێو دڵ و دەوروبەری ئەم کوێستانەدان، لـە بەشـی خۆرئاوا ئاوی چۆمی زریـسك ئـەم کوێـستانە لـە کوێـستانی بـەمۆ جیـا ئەکاتـەوە کـە چۆنیەتی جوگرافیای ئەو کوێستانەش بەم شێوەیە.

## کوێستانی بەمۆ

دوایــن کوێــستانی ئــەم ناوچـانە کـە لـە خۆرئـاوای ئـەم بەشـەی زاگرۆسـدایە، کوێـستانی بـەمۆ کـە لـە خۆرئـاوای ئەزگڵـەو باوەیـسی دایـە، بەشـێکی زۆری لـە کوردستانی ئەودیوی سنوورە لەبەر مەوقعیەتی جۆگرافیایی و ئیستراتیژیکی نیزامی نـەمانتوانی ئاگادارییـەکی باشمـان لـە سـەری بێـت، بـەس بەشـێوەیەکی زۆر کـورت و ناتەواو باسی لەسەر ئەکەین.

ئاستی بەرزایی ئەم کوێستانە کە خودی بەمۆیە ١٨٤٢ میترە و بە سەرچاوەی بەشێ لە ئاوی چۆمەکانی، ئاودالان، هەواس ئاوا، باوەیسی، ئەناسرێت، کە ئەو ئاوانەش پاش یەکگرتنیان و تێپەڕبوون لە سنووردا ئەڕژێنە ڕۆخانەی سیروانەوە.

هەروا کە وتمان لەبەر جێگیربوونی لە سنوورو مەوقعیەتی نیزامی لە سەردەمی شەڕی ئێران و ئێراقدا لە هەردوو لاوە دانیشتووی تێدا نەماوە زۆربەی گوندەکانیشی ئێستاش هەر وێرانن، کە لە بەشی ئەمدیوی سنوور ئەتوانین بەسوورە مەڕ، ئەزگڵە، کۆرەیی، وە باوەیسی، ئاماژە بکەین.

## کوێستانی کوچکسار

یەکێ ترلە کوێستانەکانی ئەم ناوچەیە کوچکسارە، کە شوێنی جۆگرافیایی لە خۆرئاوای شاری گەورەی سنە و کێوی ئاویەرو باکوورو باکووری خۆرهەڵاتی ژاوەرۆو باشووری تێژتێژدایە، کە پێك هاتووە لە کێوەکانی، هەشۆڵی، ناڵەسەخت، بەردە پەڕ، شێلالە، نەیجەڵە، شیپان، کێوی لۆ، میروەیس، بەنی گۆراڵان، سیادانە، بەردە چەرمگ، سەرکۆیی، هەنجیرلە، تەختە، بەردەکورسی، کوچکسار، کوچك خرمەڵ، چەرخەلان، کوچکەشینە، خزێڵە، قەڵای مەڕ، وەرکۆ، کۆکۆ، پۆپە کڵاو، زرێوار، کەرجۆ، وە خورەم ڕۆ، ئەڵبەتە ئەتوانین هەتا ئاویەریش بە بەشێ لەم کوێستان بزانین، کە بەرزترین شاخی ئەبێتە خودی کوچکسار بە بەرزایی ٢٩٤٦ میتر.

لە لایەن باکوورەوە لە خۆرهەڵات بەرەو خۆرئاوا ئاوی چۆمی شوێشە تێ ئەپەڕێ کە لەداوێنی باکووری ئەم کوێستانەو کێوەکانی هەنگەژاڵ، پیرئیسماعیل، وەسوڵتان ئەحمەد سەرچاوە ئەگرێ و لە نیزیکی نگڵ دا ئەڕژێتە ڕۆخانەی چۆمی گەورە یان کۆماسیەوە، ئەو ڕۆخانەیە لەو شوێنەدا بەرەو خۆرئاوا ئەڕواو پاش تێ ڕژانی ئاوی چۆمی ئەوێ هەنگ و بێساران بە ئاوی چەم گەران یان ڕەزاو بەناوبانگەو لەوێشەوە بەرەو خۆرئاوا ئەچێت، ئەم ئاوەی کە ناومان برد ئەم کوێستان لە کوێستانی پیازەو کێوەکانی تێژتێژ جیا ئەکاتەوە.

هەروەها لەو بەشەی داوێنی ئەم کوێستانەدا چەند گوندێکی تێدایە کە ناویان ئەبەین، عیسائاوا، خروسە، خۆشاو، سپی ڕان، کەڵاتە، بزان، گورگینە، دادانە، کەمانگەر، ڕەشنش، وانی کوژ، سپی بن، خواشت، کانی ڕەمەزان، وەلنگەرێژ.

لـه لایـەن خۆرهەڵاتـەوە ئـاوی چـۆمی زیاگـەرجۆ لـە داوێـنی کێوەکـانی، وردە، قەڵاوەنـد، وە هەنجیرلـە، سەرچـاوە ئـەگرێ و پـاش تێپـەڕبوونی لـەو ناوچـەیە بەرەوخۆهەڵات ئـەڕواو ئەڕژێتـە ڕۆخانـەی قـشلاخەوە کـە لـەو مەسیرەدا کێوەکـانی ئاویەرو پیرموغان لەم کوێستانە جیـا ئەکاتـەوە، هـەر لـە بەشـی خۆرهەڵاتـەوە ئـاوی چۆمی دەروێشان تـێ ئەپـەڕێ کەئـەویش لـە داوێـنی کێوەکـانی هەشـۆڵی و تەختـە و کوچکەسوورو شیانوکەڵێن سەرچاوە ئـەگرن و بـەرەو خۆرهـەڵات تـێ ئەپـەڕێ و لـە نیزیکی سواران و دەرەکۆڵەدا ئەڕژێتە ڕۆخانەی قشلاخەوە، کـە لـەو ناوانـەدا چـەند گونـدێکی تێدایـە کـە بـەناوی هەنـدێکیان قەناعـەت ئەکـەین وەك، مەلەکشا، زنـان، گەڕوسـی، سـوو، سەرسـوو، تەختـە، تـەوریوەر، شـیان، دەروێـشان، هەشـۆڵی، خانـەگا، گـەڵێن، هـەناران، کـانی قـوڕ، کـانی شـێلانان، وە سـی ئـاو، ئـەم ناوچـەیە ئەگەرچـی زەویـوزارێکی ئـەوتۆی ئـاران و دەشـتی تێـدا نییـە کەچـی بەتێکۆشـانی بێوچـانی دانیشتوانی، یـەکێ لـە باشـترین ناوچـەکانی پـەروەردەکردنی (تـوت فـەرەنگی)یـە لـە بەشـی باشـووریدا بەتێپـەڕبوونی ڕۆخانـەی قـشلاخ لـە نیزیکـی بزلانـەدا ڕۆخانـەی گاوەرۆشی تێ ئەڕژێ و شاخەی خۆرهەڵاتی سیروان پێـك دێـنێ ئـەو ڕۆخانەیـە پـاش تێپەڕبوون لە باکووری، ئەم کوێستانە لە کوێستانەکانی هـەوارە بـەرزەو کەمـەرەکۆو شاهۆ جیا ئەکاتەوە، هـەر لـەم مەسـیرەدا چـەند گونـدێکی تێدایـە وەك، نێـر، مێـراو، تەنگی سەر، سەرڕێز، کـواز، تفـێن، دەگانـاو، دزەوەنـد، سـوورەتوو، جۆلانـدێ، وەکـانی حسێن بەگ، لە لایەن خۆرئـاواوە بـە وەسـیلەی کێوەکـانی تـیرەی مـەلاو میروەیـسەوە پەیوەست ئەبێ بە کوێـستانی کۆسـالانەوە، کـە ئـاوی چـۆمی بێـساران و ئەویەهـەنگ هەرلەم بەشەداو لە داوێنی ئەو کوێستانە سەرچاوە ئەگرێ و بەرەو خۆرئـاوا ئـەڕواو پـاش تێڕژانـی ئـاوی چـۆمی چـەشمیەر بـەرەو بـاکووری خۆرئـاوا ئـەڕواو ئەڕژێتـە ڕۆخانەی چەم گەرانەوە.

که لەو مەسیرەشدا ئەم گوندانەی تێدایە، بێساران، ئەویەهەنگ، پایگـەلان، ژنـین، ئاریان، یۆژەنان، نسنار، چەشمیەر، یوزیـەر، ژان، هەرسـین، هویـە، سـەرهویە، ئـەجی، سـالایان، ویـسرە، تەکیـە، هەشـەمێز، وە حلـوان، ئەڵبەتـە لـەم چـەند سـاڵەی دوایـەدا بێساران بووە بە شارۆچکەو یەکێ لە بەشەکانی سەوڵ ئاوا.

ئـەم کوێـستانە لـە لایـەن بـاکوورەوە بەوەسـیلەی کێـوی هەنگـەژاڵ بـە کوێـستانی گەورەی چل چەمە پەیوەست ئەبێ.

## کوێستانی کەمەرەکۆ

کەمــەرەکۆ یــەکێ تــر لــە کوێــستانەکانی ئــەم ناوانەیــە کــە ئــەتوانین شــوێنی جۆگرافیـایی بـەم شـێوەیە نـاو بـەرین، لـە خۆرهـەڵاتی ژاوەرۆو بـاکووری کـامێران و خۆرئاوای جادەی کامێران بەسنــە، کە تێکڕا پێك هاتووە لـەم کێوانـە، هەوارەبـەرزە، نـزمـار، سیاسـن، سـەرکۆ، دەژن، بـەردەڕەش، یەکـشەنبە، چـەمەرگا، حـاجی کـوژ، شـەیتانە، بەردەسـوور، وەکـەمرەکۆ، کـە بـەرزترین لووتکـەی هـەوارە بەرزەیـە بـە بەرزایی ٢٩٥٠ میتر کە وا لەبەشی باکووری خۆرهەڵاتی ئەو کوێستانەدا.

لـە دامێنگـەی خۆرهەڵاتیـدا چـەند دەراو و چـۆمێکی تێدایـە کـە ناوبانگترینیـان چۆمی ئاساوڵە و خڕەڵانەیـە، کـە ئاسـاوڵە لـە دامـێنی کێوەکـانی حـاجی کـوژ، هـەزار هەزار، شەیتانە، وە بەردە سوور سەرچاوە ئەگری و بەرەو خۆرهەڵات و بـاکوور ئـەم کوێستانە ئەڕواو لە نیزیکی گونـدەکانی وامـسان و یۆسـف ئـاوادا ئەڕژێتـە ڕۆخانـەی گاوەرۆوە، ئەو ڕۆخانەش لەو شـوێنەدا بـەرەو بـاکوورو بـاکووری خۆرئـاوا ئـەڕواو لـە نیزیکی بزلانەدا بە تێڕژانی ڕۆخانەی قشلاخ هەروا کە وتمان ڕۆخانەی سیروان پێك دێنێ.

چـۆمی خڕەڵانـەیش لـە داوێـنی کێوەکـانی حـاجی کـوژ، قارەمـان، داراوی سـەروو، سەرچاوە ئەگرێ و بەرەو باشوور ئەڕواو پاش تێپەڕبوونی بـەلای شـاری کامێرانـدا و تێڕژانی چەند دەراوی کە، ڕۆخانەی رازاوەر پێك دێ و بەرەو باشوور ئەڕوا.

هــەر لــەو مەســیرەدا شــاری کــامێران و چــەند گونــدێکی وەك، تــوان کــەش، یەختـەخان، کـانی لـەیلێ، ئاسـاوڵە، نەجـەف ئـاوا، ماسـن، کولەسـار، یـەرینان، تاینـە، یەمینیان، ئیبراهیم ئاوا، نەشوور، تازئـاوا، دۆڵەگـەورە، دێرمـۆڵی، سەردەشـت، قـەران یان قڕان، وەبەردە چەرمگی تێدایە.

لە لایـەن بـاکوورو بـاکووری خۆرئـاواوە هـەروا کـە وتمـان بـە یـەکگرتنی گـاوەرۆو قشلاخ سیروان پێك دێنن، کە سیروانیش لەو بەشەی ئەم کوێـستانەدا بـەرەو باشـوور ئەڕواو لەنیزیکی پاڵنگاندا لە ئاخرین دامێنگەی ئـەم کوێـستانە جیـا ئەبێتـەوە، لـەو ناوانەشـدا چـەند گونـدێکی لێیـە کـە لـە بـاکوورەوە بـەرەو باشـوور ناویـان ئەبـەین، بزلانە، دۆڵاو، تای، نزار، پیرباغ، سێویە، مێرگەسوور، کولێن، هەنی مـن، فـەرەج ئـاوا، فارس ئاوا، وەدەژن.

لـە باشـووری ئـەم کوێـستانە ئـاوی چـۆمی شـاهێنی کـە لـە داوێـنی ئـەم بەشـەی سەرچـاوە ئـەگرێت و بـەرەو خۆرئـاوا ئـەڕوا تـا ئەڕژێتـە ڕۆخانـەی تـەنگیوەر و

سیروانەوە، هەر لەو ناوانەدا چەند گوندێکی تێدایە کە ناویان ئەبەین، ئاهنگەران، گونبەد، نەیجەقەوی، ماویان، حسین ئاوا، خان ئاوا، ئافرینە یان ئافریان، کەرەگڵ، کۆرەدەرە، کانی چەرمگ، گاوان، شاهێنی، بزوەش، کاشتەر، یوزیدەر، پیکانی، وەزەمان گریوە.

لە بەشی باکوورو باکووری خۆرئاوای ئەم کوێستانە، هەروەکو خۆرهەڵاتی کوچکسار، بەزەحمەت و تێکۆشانی دانیشتوانی ناوچەکە یەکێ تر لە شوێنە بەرهەمهێنەرەکانی (توت فەرەنگیە) هەروەها باخ و سەردرەختی باشی تێدا هاتوەتە بەرهەم.

لە بەشی باشوورو خۆرئاواشدا کە پەیوەست ئەبێ بەدەشتەکانی خۆرئاوای کامیَران و گازرخانی و بزوەش، شوێنێکی باشە بۆ کشتوکاڵ و دەغڵودان.

## کوێستانی چاڵ ئاوا

ئەم کوێستانە کە شوێنی جۆگرافیایی کەوتوەتە خۆرهەڵاتی روانسەر و باشوورو باشووری خۆرئاوای کامێران وە باکووری خۆرئاوای کرماشان، بە تێکڕا پێك هاتووە لە کێوەکانی، والآنە، هەشەلان، شاهۆی بچووك، زەڕنە، خوڕێن، شوور، هۆڵ هۆڵ، خاقانە، خڕەڕا، خۆئاخول، وەکێوی وەیس، کە بەرزترین لووتکەی شاخی زەڕنەیە بە بەرزایی ۲۵۲۵ میتر کە لەباشووری خۆرئاوای تەختی زەنگیدایە.

ئەم کوێستانە لە لایەن خۆرئاواوە پەیوەست ئەبێ بە کوێستانی گەورەی شاهۆوە هەتا هەندێ لە دانیشتوانی ناوچەکە باوەڕیان لەسەر ئەوە بوو کە ئەمیش بەشێکە لە شاهۆ.

هەر لەم ناوانەدا ئاوی چۆمی خەراجیان بەرەو باشوور ئەڕواو بە خۆرهەڵاتی روانسەردا تێ ئەپەڕێ و بە تێڕژانی ئاوی چاوگەی روانسەرو گەڕاوا و ئەو ناوانە بەرەو باشووری خۆرئاوا ئەگەڕێتەوەو بە تێڕژانی ئاوی چۆمی مەرگ رۆخانەی قەرەسوو پێك دێنی و بە باشووری ئەم کوێستانەدا تێ ئەپەڕێ و بە تێڕژانی رازاوەریش بەناوی شاری گەورەی کرماشاندا ئەڕوا.

هەر لەم ناوانەدا چەند گوندێکی تێدایە هەر لە خۆرئاواوە بەرەو باشوورو باشووری خۆرهەڵات ناوی هەندێکیان ئەبەین، پشتە، دەرەویان، خەراجیان، کلاوە، دیی باوکە، بەلەزێن، سەردم، قەڵاینە، مێرکان، یان مێرگان، گورکیدەر، حەسەن ئاوا،

باواحەیران، تەپەڕەش، دێ باغ، کولیان گەورە، شابگار، بەروەیس، راگە، سەراو شێلە وەلەعل ئاوا.

لە خۆرهەڵاتەوە رۆخانەی رازاوەرە هەروا کە وتمان پاش تێپەڕبوون لە کامێران لە خۆرهەڵاتی ئەم کوێستانەو بە کەناری جادەی کامێران بە کرماشاندا بەرەو باشوور ئەڕواو لە نیزیکی قازانچی دا ئەڕژێتە نێو قەرەسووە، کە هەر ئەم دەراو و ناوانە بوەتە هۆی جیابوونەوەی کوێستانی بێستوون و پەڕاو لەم کوێستانەو کوێستانی شاهۆ.

لە باکوورو خۆرهەڵات و باشووری ئەم کوێستانەدا دەشت و زەوینی ئارانی باشی وەك دەشتەکانی لۆن و ئەڵك و کامێران و قەرە وەیس و برنجان و گەرمەخانی و دەشتی گەورەی مایەشت و حەسەن ئاواو ناو دەروەنی لە ئامێزدایە کە بەشێ لە باشترین دەشتەکانی دوو پارێزگای کرماشان و کوردستانن، هەروەها لە بەشی باشووریدا چەند گۆم و سەرچاوگەی سروشتی تێدایە کە سەرڕێژی ئاوەکانیان ئەڕژێنە قەرەسوو.

لە باکوورەوە بەرەو خۆرهەڵات و باشوور چەند گوندێکی تێدایە کە بە ناوی هەندێکیان قەناعەت ئەکەین، لۆن، کەڵاتەرزان، تەختی زەنگی، سەرشیلان، تییانە، سورکاو، ئەڵك، دەرەویان، ماراو، وەزملە، چراغ ئاوا.

## رۆخانەکانی ئەم ناوچانە

پاش ئەو کورتە باسەی لەسەر جۆگرافیای ناوچەکانی هەورامان و چۆنیەتی جێگیربوونی کوێستانەکان و ئاماژەیە سەرپێیی بەشوێنە نیشتەجێکانی وەك شارو شارۆچکەو گوندەکان هەروەها کورتەباسێ لەسەر شاری پاوە، لێرەدا ئەچینە سەر باسی رۆخانەو چۆم و دەراوەکانی ئەم ناوچانە، ئەگەرچی لە بەشی ناساندنی کوێستانەکانا، تاڕادەیە ناو و چۆنیەتی شوێنی جۆگرافیایی رۆخانەو ئاوەکانی ئەم ناوچانەمان باس کرد، لەبەرئەوەی هەندێکیان جیا لە ناوچەکانی ناوبراو سەرچاوە ئەگرن و تێ ئەپەڕن باسی ئەوەمان نەکردووە لێرەدا ئەو هەرمانە تەواوو ئاماژە بەسەرەتا هەتا کۆتاییان ئەکەین.

پێش ئەوەی بچمە سەر ئەو باسە ئەبێ ئەوەش بڵێین، هەروا لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێ کردو دانیشتوانی ئەم ناوچانەو ئازیزانیش ئاگادارن، لەبەر کوێستانی بوونی ئەم بەشەی لە زاگرۆس زۆربەی وەرزەکانی وەشتی ساڵ باران و بەفری زۆری

لێ ئەبارێ و بەیەکێ لە شوێنە پڕ ئاوەکانی ئەم زنجیرە کوێستانە دێتە ئەژمارەوە، بەم بۆنەیەوە لە درێژایی ساڵدا رۆخانەو چۆمی پڕ ئاو و سەرچاوگەی گەورەی زۆری تێدایە کە زۆربەی ئەو ئاوانەش تا بە ئەمڕۆ کەڵکی ئەوتۆیان لێ وەرنەگیراوە.

بۆ وێنە لە سەر چاوگە گەورەکان ئەتوانین ئاماژە بەئەمانە بکەین، سەرچاوگەی (بلێ) لە خۆرهەڵاتی باکووری هەجیج، سەرچاوگەی (هانەکوان) لە باکوورو داوێنی گوندی دشەدا، سەرچاوگەی (روانسەر) لە خودی شاری روانسەردا، سەرچاوگەی (پاڵنگان) لە خودی پاڵنگان دا، هەروەها سەرچاوگەی (زەڵم) لە بەشی هەورامانی ئەودیوی سنوور و لە خۆرهەڵاتی خورماڵو نیزیکی گوندی ئەحمەد ئاوادا، وە........، کە ناکرێ باسی هەموویان بکەین، هەر ئەمانە هەر کام وێنەیەکی تایبەتین بۆ بەرفراوانی ئاو یانێ سەرچاوگەی ژیان لە درێژایی مێژوودا لەم بەشەی کوردستانی خۆشەویست.

رۆخانەو چۆمە گەورەکانی ئەم ناوچانە بریتین لە رۆخانەی (سیروان) چۆمی (پاوەرۆ) چۆمی (تەنگیوەر) چۆمی (مەڕەخێڵ) رۆحانەی (لێڵە) چۆمی (خەلیفە یان قوڕەقەڵا) رۆخانەی (زمکان) چۆمی (زریسك یان زریشك) رۆخانەی (قەرەسوو) وە لە هەورامانی ئەودیو چوومی (زەڵم) یان بیارە و خورماڵ.

## رۆخانەی سیروان

رۆخانەی سیروان یەکێ لە پڕئاوترین رۆخانەکانی ناوچەی هەورامانە کە زۆربەی ئاوەکانی هەورامان و ناوچەکانی دەوروبەری تێ ئەڕژێت و لە دوو وڵاتی ئەمڕۆی ئێران و ئێراقدا تێ ئەپەڕێ تا ئەڕژێتە رۆخانەی گەورەی دیجلەوە.

پێش ناساندنی جۆگرافیای ئەم رۆخانەیە ئەمەوێت بۆچوونی چەند نووسەرێ بخەمە بەرچاوو روونکردنەوەیە لەو بابەتە، هەرچەند لە سەرەتای دەسپێکردنی ئەم نووسراوەیەدا ئاماژەو لێکدانەوەیەکمان لەسەر هەندێ لەو بۆچوونانە کرد، لەبەرئەوەی ئەو روونکردنەوە بۆ تەواوی بەشەکانی تر بوون، ئەوا لێرەدا ئەو خاڵانە دەسنیشان ئەکەین کە پەیوەندییان بەم بەشەوە هەیە.

یەکێ لە نووسەرانی روسی بەناوی (مینورسکی) لە بارەی ئاوی سیروانەوە ئەڵێت: (رۆخانەی سیروان تا داوێنی دەماخەی کێوی هەورامان بەم ناوە ئەناسرێت) کە مەبەست کوێستانی تەخت و داڵانییە پاشان ئەڵێت، (پاڵنگان لە قەراخی رۆخانەی گاوەرۆ دایە) بەبڕوای من هیچ کام لەو بۆچوونانەی بەدروست نازانم کە پاشان

باسی ئەکەین، هەروا لە کتێبی فەرهەنگی جۆگرافیای ئێران بەشی پێنجەم پارێزگای کوردستان، بە نووسینی سەرتیپ حسێن عەلی رەزم ئارا لە بەشی رۆخانەکانی دەوروبەری سنەدا ئاوای نووسیوە (لە بەشی ناوەندی سنەدا گەورەترین رۆخانە قشلاخە کە لە بەرزاییەکانی باکووری حسێن ئاوادا سەرچاوە ئەگرێ و بەشەش کیلۆمیتری خۆرهەڵاتی سنەدا بەرەو باشوور تێ ئەپەڕێ، لەبەر ئەوەی ئەدا بەلای گوندی قشلاخدا بەم ناوە ناسراوە، ئەم رۆخانەیە لە ٣٦ کیلۆمیتری باشووری سنەدا لە باکووری بزلانە لەگەڵ رۆخانەی گاوەرۆ یەك ئەگرن و رۆخانەی ژاوەرۆ پێك دێت کە بەناوچەی ژاوەرۆدا تێ ئەپەڕێ و لە بەشی هەوراماندا پاش تێ رژانی رۆخانەی رەزاوی مەریوان بەناوی رۆخانەی سیروان لە وڵاتی ئێراندا ئەچێتە دەرێ) هەر ئەو سەرچاوەیە لە بەشی هەورامانی تەختدا ئەڵێت (رۆخانەی مەریوان لەو مەڵبەندەی لەگەڵ رۆخانەی کەڵاتەرزان لە نیزیکی گوندی دوورەدا یەك ئەگرن و پاش تێپەڕبوونی لە سێ کیلۆمیتری شاری هەورامانـدا لە نێوان گوندەکانی نوین و ئەسپەرێزو هەواس ئاوا ئەڕژێتە رۆخانەی سیروانەوە کە لە ناوچەی ژاوەرۆوە دێت) مەبەست لەو چەند دێڕەیە کە لەو سەرچاوەیە هێناومە ئەمەیە، ئەگەر بەوردی سەیری ئەو بۆچوونەی پێشوو ئەمەی بگەین بۆمان دەرئەکەوێ کە نادەن لەیەك و خودی نووسەر، نووسراوەکەی خۆی رەد ئەکاتەوە، لەپێشدا ئەڵێت رۆخانەی ژاوەرۆ کە بەناوچەی ژاوەرۆدا تێ ئەپەڕێ، کەچی لێرەدا ئەڵێت ئەڕژێتە رۆخانەی سیروانەوە کە لەناوچەی ژاوەرۆوە دێت، یان لە پێشدا باسی رۆخانەی رەزاو ئەکات کەچی لێرەدا ئەڵێت رۆخانەی گەڵاتەرزان و مەریوان، باشە ئەو دوو رۆخانەیە کە یەکیان گرت بە چ ناوێکەوە بەو ناوانەدا تێ ئەپەڕێ، بەس ئەویش بەجوانی سەرەتای دەس پێکردنی سیروانی نەناسیوە.

لە کتێبی (گیتاشناسی) جەلدی یەکەم بەنووسینی ئەندازیار عەباسی جەعفەری لە بەشی کۆساڵان و شاهۆدا باسی رۆخانەی سیروان ئەکاو بەدووشاخەی دائەنێ، کە شاخەی مەریوان لە دووروە بەخوارەوە و شاخەی ژاوەرۆی لە پاڵنگان بەخوارەوە بەو ناوە ئەیناسێت، لە کتێبی جۆگرافیای ئێران بەنووسینی ئاخوند فەرەجی لە هەر دوو پارێزگای کرماشان و کوردستانا رۆخانەی سیروان بە دیالە ناو ئەبات.

کاتێ سەیری ئەو بۆچوونانە ئەکەین و بە وردی ئەیان خوێنینەوە لەگەڵ واقعیەتی مەکانی و جۆگرافیایی سیروان بەراوردیان ئەکەین دەبینین کە وا نییە، لەگەڵ ئەمانەشدا یەکێ لە نووسەرانی ناوخۆ تاڕادەیە بیروڕایەکی باشی لەم

بارەیەوە دەربڕیوە کە ئەویش میرزا سەید جەعفەرخانی مەهەندیس باشی ناوبانگ بە (موشیرول دەولە) کە لە ساڵەکانی ١٢١٢ تا ١٢٧٩ه ق کاربەدەستی سەردەمی قاجارییەکان بووەو هەتا لەو کاتەدا لەلایەن ئەمیر کەبیر لە ساڵانی ١٢٦٥ تا ١٢٧١ دەبێ بە بەرپرسی دیاریکردنی سنووری نێوان ئێران و عوسمانلی، کە لەسەر ڕۆخانەی سیروان ئاوا دەڵێت لەنیو فەرسەخی شاری سنە ڕۆخانەیە بەناوی قشلاخ تێ دەپەڕێ و پاشان لەگەڵ ڕۆخانەی گاوەرۆ کە لە ناوچەی کولیاییەوە دێت یەك ئەگرن و سیروان پێك دێنن تا تێرژانی ڕۆخانەی زەهاو لەو ناوانەیش تێ دەپەڕی و لەوێ بەولاوە بەدیالە دەناسریت، جیا لەم نووسەرە بۆمان دەرئەکەوێ کە هیچ کام لەوانی کە بەباشی نەیان توانیوە سەرەتاوکۆتایی ڕۆخانەی سیروانمان بۆ دیاری بکەن، بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو بابەتەش گەڕانێکی زۆرم لە ناوچەکەدا کردو بە پرس و جۆیە لەدانیشتوانی دەوروبەری ئەو ڕۆخانەیە و سەیری دیوانی شاعیرانی وەك بێسارانی و مەولەوی و میر ئەولقادری پاوەیی و.... هەر وەها نەقشەی پارێزگای کرماشان و کوردستان، بەو بڕوایە گەیشتم کە ڕۆخانەی سیروان سەرەتا لە دوو شاخەی مەریوان و ژاوەرۆ پێك هاتووە، کە شاخەی ژاوەرۆ بە یەکگرتنی گاوەرۆو قشلاخ لە ٤٠ کیلومیتری خۆرهەلاتی باکووری پاڵنگان وە ٣٦ کیلومیتری باشووری سنە بەم ناوە ناسراوە، شاخەی مەریوانیش لە پێکهاتنی ڕەزاو یان چەم گەران وەگاڕان لە نیزیکی دووروەدا بەم ناوە ئەناسرێت و بەرەو خۆرئاواو باکووری خۆرئاوا ئەڕواو تا تێ ڕژانی ڕۆخانەی ئەڵوەند لە نیزیکی خانەقین دا بەم ناوە ناسراوەو ئەناسرێت.

ئێستا کە ئەوەمان ڕوون کردەوە ئەچینە سەر جۆگرافیای سیروان و هەر لەو دووشاخەی سەرەکییەوە دەس پێ ئەکەین.

شاخەی ژاوەرۆ: پێك هاتووە لە سێ شاخەی گاوەرۆو قشلاخ و تەنگیوەر، کە شاخەی گاوەرۆ سەرەتا لەداوێنی کێوەکانی، خاڵ بەفر، کانی کەوە، لۆجاڕ، پیرە، دەرەکەوە، لە باکووری خۆرهەلاتی سنقورو کولیایی، وەباکووری خۆرئاوای ئەسەد ئاوای هەمەدان، وەباشووری خۆرئاوای قوروەدا، سەرچاوە ئەگری و بەرەو خۆرئاوا تێ ئەپەڕێ و لە نێو ڕێگادا ئاوەکانی چۆمی گردەکان، چۆمی ڕەش، کرماجان، ئاساوڵە، نەران، وەچۆمی شێنەی تێ ئەڕژێت، کە ئەوانیش لە داوێنی کێوەکانی سێ پەلان، کلوور، باڵەخانە یان باڵەخانی، سایەلی یان سەید عەلی، قەرەخامە، دووماڵە، وەیسە، ماریف، سراج ئەدین، سێگاویان سەرکاو، سووراوڵە، بەردەسوور، سولتان کۆ،

مەلەكان، خۆشیلان، كۆی روسەم، دووبەران، وە..... كە لە ناوچەكانی كولیایی و گاوەرۆوە سەرچاوە ئەگرن و باش یەكگرتنیان لەگەڵ گاوەرۆداو تێپەڕ بوون لە سەدی گاوشان كە بە تازەگی لەو ناوانەدا ساز كراوە، لە نیزیكی گوندەكانی وامسان و یۆسف ئاوادا بەرەو باكووری خۆرئاوا ئەڕواو لە نێوان گوندەكانی ئەسكەران و بزلانەدا لەگەڵ شاخەی قشلاخ یەك ئەگرن.

شاخەی قشلاخیش لە باشووری خۆرئاوای دیواندەرەو باكووری خۆرهەڵاتی حسێن ئاوا و داوێنی كێوەكانی، پیرمەحمود، كانی كەتان، سەموور سنجان، حاجی باوا، مەلەكە، شێخ مارف، كەوەسوار، كانی گەورە، ئاڵمالو، سەرسێوگە، كۆژە، سەید ئەوڕەحمان، زەرد ئاوا، هاڵە رەش، قەڵواز، وە دوونێرە، سەرچاوە ئەگرێ و بە یەكگرتنی ئەو ئاوانە رۆخانەی قشلاخ دێتە ئاراوەو بەرەو باشوور تێ ئەپەڕێ و لە نیزیكی گوندی قشلاخدا ئەڕژێتە نێو سەدی قشلاخەوە، كە بۆ ئاوی خواردەمەنی شاری گەورەی سنەو كشتوكاڵی ئەو ناوانە كەڵكی لێ ورەئەگیرێت، سەرڕێژی ئەو ئاوە بە خۆرهەڵاتی شاری سنە یان باشتر وەهایە كە بڵێین بە ناوی شاری سنەدا تێ ئەپەڕێ و لەو ناوانەشدا ئاوی چۆمی سۆفیان و سەڵوات ئاوای تێ ئەڕژێ، كە ئەو ئاوانەش لە داوێنی كێوەكانی، مراد ئەنسار، هەنگەژاڵ، قەیتوور، قازان، زەمان، خەسرەو گوژ، سەرچاوە ئەگرن و پاش تێرژانیان بە رۆخانەی قشلاخ، ئەویش بەرەو باشووری سنە ئەڕواو تا گەیشتنی بە رۆخانەی گاوەرۆ ئاوی چۆمەكانی، گریاشان، زیاگەرجۆ، هەشۆڵی، وە دەروێشانی تێ ئەڕژێ، كە ئەو ئاوانەش لە داوێنی كێوەكانی، قەڵوەند، هەشۆڵی، هەنجیرە، كوچكسار، كوچك خرمەڵ، تەختە، وەشیان، سەرچاوە ئەگرن و ئەڕژێنە قشلاخەوە، هەروا كە وتمان لە ٣٦ كیلو میتری باشووری سنەدا لەگەڵ شاخەی گاوەرۆ ئەبن بە یەكێ و رۆخانەی سیروانی شاخەی ژاوەرۆ پێك دێنن، سیروانیش لەو شوێنەدا بەرەو خۆرئاواو باشووری خۆرئاوا ئەڕوا و لە نیزیكی پاڵنگاندا ئاوی چۆمی تەنگیوەری تێ ئەڕژێت، كە ئەو ئاوەش لە داوێنی خۆرهەڵاتی كوێستانی شاهۆو خۆرئاوای كێوەكانی یەكشەنبەوەو باكووری تەختی زەنگی وناوچەی لۆن و خۆرئاوای گامێران سەرچاوە ئەگرێ و پاش تێپەڕبوونی لەناوانی گازرخانی و تەنگیوەردا لە باكووری پاڵنگاندا ئەڕژێتە سیروانەوە، سیروانیش پاش تێپەڕبوونی لەو ناوانەدا بەرەو خۆرئاوا تێئەپەڕی و لە نیزیكی گوندەكانی ئەسپەرێزو نویندا لەگەڵ شاخەی مەریوان یەك ئەگرن.

شاخەی مەریوانیش لە دوو شاخە پێك هاتووە، چۆمی گەران، وەچۆمی گردەلانە، چۆم گەران کەرەزاویشی پێ ئەوترێ لە سێ شاخەی چۆمی بێساران و چۆمی نگڵ و چۆمی شوێشە پێك هاتووە، چۆمی بێساران کە ئەویەهەنکیشی پێ ئەوترێ لە داوێنی باکووری خۆرئاوای کوێستانی کوچکسارو کێوەکانی دەوروبەری سەرچاوە ئەگرێ، شاخەی نگڵ و چۆمی شوێشەیش لە ئاوەکانی چۆمی گەورەو چۆمی کاکۆ زەکەریا پێك هاتوون کە ئەوانیش لە داوێنی کێوەکانی، کانی چەرمگ، دەروێش ئەولیا، گەورەکۆ، ئەختەران، پیرئیسماعیل، سوڵتان ئەحمەد، حەسەن قەرە سەرچاوە ئەگرن و پاش تێپەڕبوونی لە باکووری خۆرئاوای نگڵەوە لە داوێنی گوندی لەنگەرێز لەگەڵ ئاوی چۆمی بێساران یەك ئەگرن و چۆم گەران یان رەزاو پێك دێنن و بەرەو خۆرئاوا تێ ئەپەڕی و لە نیزیکی سەوڵ ئاوا یان باشتر بڵێین دوورەوەدا لەگەڵ ئاوی چۆمی گردەلانەدا ئەبن بە یەکێ.

شاخەی گردەلانەش لە چۆمەکانی زرێوارو شیانەو گاران پێك دێ، کە چۆمی زریوارو شیانە لە داوێنی کێوەکانی، میرحاج، وەلگەوەر، دالەمەز، موجات، قەلازیان، وە..... سەرڕێژی گۆمی زرێوارو دەوروبەری سەرچاوە ئەگرێ و بەرەو باشوورو باشووری خۆرهەلات ئەڕوا، شاخەی گاڕانیش لە داوێنی کێوەکانی باکوورو باکووری خۆرهەلاتی مەریوان و لە ناوچەی چنارەو لە بەشی باشوور خۆرئاوای کوێستانی چلچەمە سەرچاوە ئەگری و بە تێپەڕبوونی بەرەو باشوورو بە تێڕژانی ئاوی ئەو ناوانەش لە نزیکی گوندی قەلاگادا لەگەڵ چۆمی شیانەو زرێواردا یەك ئەگرن و بەرەو باشووری خۆرهەلات ئەرواو هەروا کە وتمان لە نیزیکی دوورەوەدا لەگەڵ شاخەی چۆم گەران یەك ئەگرن و سیروانی شاخەی مەریوان پێك دێنن، سیروانیش لەو ناواندا پاش نیوە دەورێ بەرەو باشوور ئەڕواو بە تێپەڕبوونی لە نێوان کێوەکانی کۆسالان و عەودالان و پیررۆسەم لە نیزیکی گوندی بلبەر ئاوی چۆمی هەورامان و بلبەریشی تێ ئەڕژێت کە ئەویش لە داوێنی کێوەکانی دالانی و تەخت و دەوروبەری هەورامان سەرچاوە ئەگری و بەرەو باشووری خۆرئاوا ئەڕواو لە خۆرهەلاتی گوندی بلبەردا ئەرژێتە سیروانەوە، سیروانیش لەو شوێنە بەولاوە بەرەو خۆرهەلات و خۆرهەلاتی باکووری ئەڕواو بە تێپەڕبوونی لە داوێنی گوندەکانی ژیوارو سلێن و وەرگەوێڕو هەواس ئاوا وەك وتمان لەدووئاوانی ئەسپەرێزو نویندا لەگەڵ شاخەی سیروانی ژاوەرۆ ئەبن بەیەکێ و سیروانی گەورە پێك دێنن، سیروانیش لەو شوێنەدا بەرەو خۆرئاواو لەنێوان کوێستانەکانی شاهۆ و

دالآنیـدا تـێ ئەپـەڕێ و تـا دووئـاوانی هـیروێ ئـاوی چـۆمەکانی نـاو و سەرچـاوگەی گەورەی (بلێ) و داریان و زەلتەو و ڕاو شەڕکان و نەروی تێ ئـەڕژێت، کـە ئەوانـەیش لە داوێـنی خۆرهـەلات و بـاکووری خۆرهـەلآتی کوێـستانی تـەخت و دالآنـی و داوێـنی خۆرئـاوای کوێـستانی گـەورەی شـاهۆ سەرچـاوە ئـەگرن ئەڕژێنـە سـیروانەوە، لـە دووئـاوانی هیروێـش ئـاوی پـاوەرۆی تـێ ئـەڕژێت، ئـەو ئـاوەش لـە داوێـنی باشـووری گوندی شمشیر سەرچاوە ئەگری و پاش تێپەڕبوونی بەرەو خۆرئـاوا و تێرژانـی ئـاوی چۆمی دووریسان و پاوە بە پاوەرۆ ئەناسرێت و ئەدا بـەنێو گونـدی خانـەگاو داوێـنی گوندەکانی دەرمورو گرالێ و دشەدا و بە تێرژانی ئاوەکانی چۆمی میرئـاواو نۆریـاو و دشـەو سەرچـاوگەی گـەورەی هانـەکوان لـەوێوە بـەرەو بـاکووری خۆرئـاوا ئـەڕواو لـە نیزیکی گەنجگەدا ئاوی چۆمی ساوسانی تێ ئەڕژێ، کە ئەویش لە داوێنی گونـدەکانی نجارو کۆمەدەرەدا سەرچاوە ئەگرێ و لە گەنجگەدا ئەڕژێتە پاوەرۆوە کە لـەو شـوێنە بەو لاوە بەرەو خۆرئاوا ئەڕوات تا ئەڕژێتە سیروانەوە.

سـیروانیش لـەوێ بـەولاوە بـەرەو خۆرئـاوا ئـەڕواو پـاش تێپـەڕبوونی لـە داوێـنی گونـدەکانی هـیروێ و نەیـسانەو شـێخان بـەرەو باشـووری خۆرئـاوا ئـەڕوات، لـەو ناوانەیشدا ئاوی چۆمی نەوسو و تەوێڵەی تێ ئەڕژێ کە ئەویش لە داوێنی کێوەکـانی شەمش و دالآنی و پەروینێ کە دەبنە باشوورو باشووری خۆرئاوای کوێستانی تـەخت سەرچـاوە ئـەگرن و لـە گونـدی شـێخانا ئەڕژێتـە سـیروانەوە، سـیروانیش پـاش تێپـەڕبوونی لەگونـدی شـێخان و داوێـنی گونـدی بەلـەبزان تـا نیزیکـی دڕۆڵـە بـە سـنووری ئێـران و ئێـراق ناسـراوە لـەو ناوانەشـدا لـە بەشـی ئـەودیوی سـنوور ئـاوی چۆمی هاواری تێ ئەڕژێت کە ئەویش لە داوێنی شنروێ و پەروێنـە کـە بەشـێکن لـە کوێستانی تـەخت سەرچـاوە ئـەگرێ، لـە بەشـی ئـەم دیـوی سـنوور ئـاوی چـۆمەکانی بەلـەبزان و زی و هێرتـا کـە لـە داوێـنی کێوەکـانی کرنـدو گـەزەن و وشـکەناو کـە بەشـێکن لـە کوێـستانی ئاتەشـگاو گـەزەن سەرچـاوە ئـەگرن و ئەڕژێنـە سـیروانەوە هەروەها ئاوی چۆمی مـەڕە خێڵـی تـێ ئـەڕژێت، کـە ئـەویش لـە ناوچـەی باینگانـەو داوێنی کوێستانەکانی ئاتەشگاو ماکوانەوە سەرچاوە ئەگرێ و بە تێپـەڕبوونی بـەرەو خۆرئـاوا لـە کـەناری وەرامـچەدا ئەڕژێتـە سـیروانەوە، لـە دڕۆڵەشـدا ئـاوی ڕۆخانـەی لێڵەی تێ ئەڕژێت، کە شوێنی جوگرافیایی ئەویش بەم شێوەیە.

## رۆخانەی لێڵە

رۆخانەی لێڵە بە یەکی تر لە رۆخانەکانی ئەم ناوچەیە دێتە ئەژمارەوە کە شوێنی جۆگرافیایی و سەرچاوەکانی و چۆنیەتی تێپەڕبوونی بەم شێوەیە.

رۆخانەی لێڵە لە دەوروبەری شاری جوانرۆ و داوێنی کێوەکانی بەنی گاز، بازیان، ژیلان، کەشەکۆ، سەرمەلەکشاهی، شەش دۆڵ، گەردە بەرگیر، بلحەیس، سەرچاوە ئەگرێ و پاش تێپەڕبوونی لە باشوورو خۆرئاوای جوانرۆداو تێرژانی ئاوەکانی ئەو ناوانە لە نیزیکی سپی ئاودا ئاوی چۆمی خەلیفەو قورەقەڵایشی تێ ئەڕژێ کە ئەویش لە داوێنی باشووری کوێستانی شاهۆو باکووری کێوەکانی گەرمەزناو و ئاوتەو باڵەخانی سەرچاوە ئەگرێ.

پاش تێرژانی ئەو ئاوە رۆخانەی لێڵە بەرەو خۆرئاوا بە نێوانی کوێستانەکانی ماکوانی گەورەو بچووك و سیا دا ئەڕواو لە داوێنی گوندەکانی  سوورەوان، زێران، هەناوڵان، کوێڵە، لۆلم، لەمە، کلاش، مزران، قەلاجێ، دۆڵەتا، مەڕەماران، پسەخۆر، کلوور، وە. ..... تێ ئەپەڕێ و بەتێرژانی ئاوی ئەو ناوانەیش لە نێوان کانی سالارو دڕۆڵێی خواروودا ئەڕژێتە سیروانەوە، سیروانیش پاش یەکگرتنیان لەگەڵ لێڵەدا بە ناوچەکانی دڕۆڵێی تالگۆزی دا ئەڕواو ئەڕژێتە (ئاوبەند) یان سەدی دەربەندیخانەوە کە جاربەجار ئاوی ئەو ئاوبەندە تا نیزیکی دڕۆڵێ دیەتە دواوە، هەرلەو ناوانەشدا ئاوی رۆخانەی زمکانیشی تێ ئەڕژێ، کە جۆگرافیا و شوێنی تێپوڕبوونی ئەویش بەم شێوەیە.

## رۆخانەی زمکان

زمکان یەکێ تر لە رۆخانەکانی ئەم ناوانەیە کە بە ناوچەی سەلاس و باوەجانیدا تێ ئەپەڕێ و ئەتوانین پاش سیروان بە گەورەترین رۆخانەی دابنێین، کە ئەویش پێك هاتووە لە دووشاخە، چۆمی زریسك یان زریشك، وەخۆدی زمکان، کە شاخەی ئەسڵی یانێ هەمان زمکان لە داوێنی کێوەکانی باکوور وەباکووری خۆرهەلاتی شاری کرندو باکووری گاوارە سەرچاوە ئەگرێ و ماوەیە بەرەو خۆرهەڵات و باکووری خۆرهەڵات ئەڕواو لە نیزیکی هەزار خانی گاوارەدا هەڵ ئەگەڕێتەوە بەرەو باکووری خۆرئاواو پاش تێپەڕبوونی لە ناوچەی زمکان و تێرژانی ئاوەکانی ئەو ناوانە رۆخانەی زمکان پێك دێنێ و لە داوێنی کێوەکانی بەنی گازو شیفلەو کانی دەران، کە لەو ناوانەدا ئەبێتە هۆی جیابوونەوەی کوێستانی بازان لە

کێوەکانی نسارو بەردە رەشە یان (سنگ سیاه) کە ئەوانیش پەیوەست ئەبن بە کوێستانی دالأهۆوە، جیا ئەکاتەوەو لە نیزیکی قوڵقوڵەدا بەرەو باکوور ئەبێتەوەو پاش تێپەڕبوونی لە داوێنی کێوەکانی قەجەرو نەهین و بە تێرژانی ئاوی چۆمی باوا شاوەیس و بانی میران بەرەو خۆرئاوا ئەبێتەوەو ئەدا بە نێوان دوو کوێستانی نەهین و دەری داو لە داوێنی گوندەکانی چەمەرە، تەڵە توو، جەنگە، هاڵە، سوورئاو، نەهێن، هماجگە، عەلیخانی، بەشی ناوخاس، کە لە نیزیکی بانی نارو پردی زمکان ئاوی شاخەی دووهەم یانی چۆم زریسکی تێ ئەڕژێ، کە ئەویش لە ناوچەی سەلاس و باوەجانی و داوێنی کێوەکانی داڵەهۆو شیفلەو خۆرئاوای بالأنبۆ و دەوروبەری کانی دانیال و قوڵ قوڵەدا سەرچاوە ئەگرێ و پاش تێپەڕبوونی بەرەو خۆرئاوا ئاوی دەشتی وڕو شاری تازئاوای تێ ئەڕژێ و لەوێدا بەرەو باکووری خۆرئاوا ئەبێتەوەو ئەدا بە کەناری گوندەکانی خانە شوورو قاڵیچەدا و لەوێدا بەرەو باکوور لە داوێنی کێوەکانی دەری و باوا شاوەیس و سەرووەراندا ئەڕوا، لەم ناوانەشدا ئەم ئاوە کوێستانی دەری و بەمۆ لە یەك جیا ئەکاتەوە، پاش تێرژانی ئاوی ئەو ناوانەش هەروەها کە وتمان لە نیزیکی پردی زمکانا لەگەڵ شاخەی زمکان یەك ئەگرن و لەوێدا بەرەو باکووری خۆرئاوا ئەڕواو ئەڕژێنە نێو ئاوی دەربەندیخانەوە.

ئاوی دەربەندیخانیش، کە پێك هاتووە لە سیروان، لێڵە وە زمکان لە بەشی ئەم دیوی سنوور وە چۆم و رووبارەکانی زەڵم، چەقڵ ئاوا، وە تانجەرۆ، لەودیوی سنوور کە ئاوی چۆمی زەڵم پەیوەندی هەیە بە نووسینەکەی منەوە کە ئەویش ئاوایە.

## چۆمی زەڵـــم

لە بەشی ئەودیوی سنوور ئاوی چۆمی زەڵم و خورماڵ کە پەیوەندی بەم باسەوە هەیە، چۆنیەتی جۆگرافیای ئەویش بەم شێوەیە.

چۆمی زەڵم کە بە چۆمی خورماڵ و بیارەش ئەناسرێت، زۆربەی ئاوی سەرڕێژی سەرچاوگەی گەورەی زەڵم، بەتایبەت لە وەرزەکانی بەهارو زستانا پێك هاتووە، کە ئەو سەرچاوەش لە داوێنی کوێستانی تەخت و دالأنی دا و لە کەناری گوندی ئەحمەد ئاوا هەڵ ئەقوڵێ و بەرەو خۆرئاوا ئەڕواو لە کەناری شاری خورماڵدا ئاوی ئەو ناوانەو چۆمی بیارەیشی تێ ئەڕژێ، کە ئەویش لە داوێنی کێوەکانی دالأنی و کەماجاڕو شرام و شێنەدا و دەوروبەری گوندەکانی کەیمنەو بێروازو هانەگەرمەڵە لەئەم دیوی سنوور سەرچاوە ئەگرێ و بە تێپەڕبوونی لە شارۆچکەی بیارەو

یەکگرتنیان لەگەڵ سەرچاوگەی زەڵم بەرەو خۆرئاوای خورماڵ ئەڕواو لە باشووری خۆرهەڵاتی سەید سادقا لەگەڵ ئاوی چەقڵ ئاوا پاشان تانجەرۆ یەك ئەگرن و ئەڕژێنە دەربەندیخانەوە، ئەو ئاوانەش پاش تێپەڕبوون لە ئاوبەند یان سەدی دەربەندیخان هەر بەناوی سیروان ئەناسرێ و بەناوبانگە، کە لەوێشدا بەرەو خۆرئاوا و باشووری خۆروئاوا ئەڕواو لەو ناوانەشدا چەند چۆمێکی دیکەی تێ ئەرژێ، کە زۆربەیان لە ئزگڵەو باوەیسی و داوینی کێوەکانی، گاراو دابالەو، گاورا، باغ کۆ، چال ئاوا، بەمۆو، زەنگەنە، تەق تەق، مرادخان وە تیلەکۆ هەروەها ناوچووی قەرەداغ سەرچاوە ئەگرن و ئەڕژێنە سیروانەوە، سیروانیش هەروا بەرەو خۆرئاوا ئەڕواو لە نیزیکی خانەقین و جەلەولادا ئاوی ڕۆخانەی ئەڵوەندی تێ ئەرژێ و بە یەکگرتنی ئەو دوو ئاوە ڕۆخانەی دیالە پێك دێ و دیالەش بەرەو خۆرئاواو باشووری خۆرئاوا ئەڕواو لە نیزیکی بەغدا ئەرژێتە دیجلەوە، دیجلەیش دیارە پاش تێ ڕژانی فورات و یەکگرتنیان لەگەڵ کاروون ئەڕژێنە خەلیجی فارسەوە.

## ڕۆخانەی قەرەسوو

یەکێ تر لە ڕۆخانەکانی ئەم ناوانە ڕۆخانەی قەرەسووە کە زۆربەی لە سەرڕێژی ئاوی چاوگەی گەورەی روانسەرو داوێنی باشوورو خۆرهەڵاتی کوێستانی شاهۆوە سەرچاوە ئەگری و بەرەو باشووری روانسەر ئەڕواو لە نیزیکی تەپە رەشدا ئاوی چۆمی گەڕاو یان گەناوی پێ زیای ئەبێ، کە ئەویش لە داوێنی کێوەکانی، سەوز عەلی، چەرمەو، خۆرهەڵاتی نسارو سیاو باکووری مایەشتدا سەرچاوە ئەگرێ و بەرەو باشوور ئەڕواو بەتێپەڕبوونی لە ناوچەی مایەشتدا و تێرژانی ئاوی ئەو ناوانەش بەرەو باشوور و باشووری خۆرهەڵات ئەڕواو لە نیزیکی (شابگار)دا ئاوی ڕۆخانەی مەرگی تێ ئەرژێت، کە ئەویش لە ناوچەی مایەشت و خۆرئاوای کرماشاندا سەرچاوە ئەگرێ و بە تێرژانی ئەو ڕۆخانەیە قەرەسوو پێك دێ و لەوێیشەوە بەرەو خۆرهەڵاتی باشووری ئەڕواو لە نیزیکی قازانچی دا ئاوی چۆمی رازاوەری پێ زیاد ئەبێ و ئەدا بەنێو شاری گەورەی کرماشاندا، پاشان بە تێرژانی ڕۆخانەی گاماسی و ئاوەکانی ئەو ناوانە بەرەو باشوورو باشووری خۆرئاوا ئەگەڕێتەوەو لە نیزیکی سوومارو ئەیلامدا لەگەڵ ڕۆخانەی سەمیرە روود یەك ئەگرن و ڕۆخانەی گەورەی کاروون پێك دێ کە پاشان ئەڕژێتە خەلیجی فارسەوە.

ئەوە بوو کورتە باسێك لە سەر ناساندنی ناوچەکانی هەورامان و دەوروبەری و چۆنیەتی شوینی جۆگرافیایی کوێستان و رۆخانەو هەروەها شوێنە نیشتەجێکانی بە شێوەیەکی گشتی، هەرچەند ئەزانم زۆربەی ناوەکان بە دروستی و وەك خۆیان بەشێوەی خۆماڵی نەنووسراونەتەوە ئەویش لە بەر دەس رەسی نەبوونمان بەو شوێنانە و نەبوونی سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراو، هیوادارم لە پاشەرۆژدا بەرپرسانی ئەو ناوچانە یاریدەرمان بن بۆ زیاتر روونکردنەوە لەم بابەتەو هەروەها ئامارو ئەرقامی دانیشتوان و رادەی خوێندەواری و ئاستی خزمەتگوزاری و دەس بە کاربوون یان رادەی بێکاری، بە شێوەیەکی زانستییانە و بەلگەی باوەڕپێکراو، هەتا بتوانین لە بەشی دووهەمی ئەم نامیلکەیەدا بیان نووسین و بکەونە بەردەستی هەمووان، هەروەها چاوەروانی ئەوەیشم کاربەدەستانی هەورامانی ئەودیویش یارمەتیمان بدەن بۆ روونکردنەوە و ناساندنی ئەو بەشەی لەم ولاتە خۆشەویستە تا ئەوەی کە هەیەتی هەر وەکو خۆی تۆمار بکرێت و بدرێتە دەستی چینی دوارۆژ.

بە سپاسەوە - موحەممەد رەشیدی ئەمینی

پاوە ٧٢/٢/٢٠

## سەرچاوەکان


کوهها و کوهنامەی ئێران ئەندازیار عەباس جەعفەری
جۆگرافیای ئێران ئاخوند فەرەجی
جۆگرافیای دەرسی ناوەندی کرماشان ساڵ دووهەمی ناوەندی
کرماشان و تەمەدونی کۆن ئیرەجی ئەفشاری سیستانی
گۆڤاری جستان ژمارەی ٨٦و ٨٧ وتاری مینورسکی
مێژووی کوردو کوردستان ئیمام مەردۆخ
فەرهەنگی جۆگرافیای ئێران جەڵدی پێنجەم رەزم ئارا
فەرهەنگ لۆغەتی (دهخدا، برهان قاتع، وەموعین)
نەخشەی پارێزگاکانی کرماشان و کوردستان
کێوە نەناسراوەکانی خۆرئاوا لە ئاویستادا دەوڵەت شاهی
مێژووی گوزیدە مستۆفی
مێژووی وێژەی کوردی بۆرەکەیی
مێژووی جۆگرافیای کوردستان عەبدوالقادری بابان
مێژووی ئەدەبیات ئێران زەبیح الله سەفار
مێژووی کامل ئیبنی ئەسیر
مێژووی ماد دیاکۆنوف
مێژووی سەلاتینی هەورامان دەستخەت

مێژووی زمان و ئەدەبیاتی ئێران پرۆفیسۆر شوشتەری
رۆژنامەی ئیتلاعاتی ساڵی ١٣٥١ هەتاوی
المعجم شەمس قەیسە رازی
رەسەنایەتی زمانەکەت بناسە هەورامانی
ئێران لە سەرەتای مێژوودا جورج کامرۆن
مێژووی ئەدەبی کوردی خەزنەدار
فەرهەنگی ئایرین واچ هەورامانی
ئەوێستا هاشمی رەزی
گوڵزاری هەورامان هەورامانی وە.....

| | |
|---|---|
| شاعیرانی کورد پارسی گویی | حەیرەت سەجادی |
| مێژووی کرماشان | موحەممەد عەلی سوڵتانی |
| حەدیقەی سـوڵتانی | = = = = |
| خەسرەوو شیرین | خانای قوبادی |
| مێژووی شەرەفنامە | شەرەفخانی بەدلیسی |
| مەشاهیری کورد - جەڵدی یەکەم | بابا مەردۆخ |
| دیوانی مەلا پەرێشانی دینەوەری | مەلا پەرێشان |
| دیوانی مەولەوی | مەولەوی تاوگۆزی |
| دیوانی سـەیدی | سەیدیی هەورامی |
| دیوانی بێسارانی | بێسارانی |
| دیوانی پیر شالیار | شاعیرانی هەورامان |
| دیوانی میرزا ئەولقادری پاوەیی | میرزا ئەولقادر |
| دیوانی مەهجوری کوردستانی | مەهجوری |
| مێژووی هەورامان | مزەفەری بەهمەن سوڵتان (د - کەریمیان) |
| کەشکۆڵی شێخ عبدالمؤمنی مردوخی | ئەنوەری سوڵتانی |
| زاراوەکانی زمانی گۆران | کاریل هدنگ |

وە. ...........

## کتێبە چاپکراوەکانی
## کۆڕی زانیاری کوردستان و ئەکادیمیای کوردی

### کۆڕی زانیاری کوردستان:

١) فەرهەنگی زاراوە (عەرەبی ـ کوردی)، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٢، (١٤٢ لاپەڕە).

٢) کوردی تورکمانستان ـ مێژوو ـ ئەتنۆگرافیا ـ ئەدەب، د. مارف خەزنەدار، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٣، (٢٥٨ لاپەڕە).

٣) زاراوەی یاسایی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٠ لاپەڕە).

٤) زاراوەی کارگێڕی، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٤٧ لاپەڕە).

٥) من ینابیع الشعر الکلاسیکي الکردي، ج١، رشید فندی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢٤٠ لاپەڕە).

٦) ڕێنووسی یەکگرتووی کوردی، بەدران ئەحمەد حەبیب، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٥٦ لاپەڕە).

٧) ڕێزمانی کەسی سێیەمی تاک، د.شێرکۆ بابان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (١٥٩ لاپەڕە).

٨) چـوارینێن خـەیام، د. کـامیران عـالی بـەدرخان، وەرگێڕانـی لـە لاتینییـەوە د. عەبدوڵلا یاسین ئامێدی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، سـاڵی ٢٠٠٤، (٩٤ لاپەڕە).
٩) شـێوەی سـلێمانی زمـانی کـوردی، د. زەریێ یوسـوپۆڤا، و: لـە ڕوسـییەوە د. کوردستان موکریانی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، سـاڵی ٢٠٠٥، (٢١٦ لاپەڕە).
١٠) العروض في الشعر الكردي، احمد هردی، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی ڕۆشـنبیری، ساڵی ٢٠٠٤، (٢١٨ لاپەڕە).
١١) ژانرەکـانی ڕۆژنامــەوانی و مێـژووی چـاپخانە ١٤٥٠ ـ ١٥٠٠، د. مەغدیـد سـەپان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٨ لاپەڕە).
١٢) زاراوەی ڕاگەیاندن، لیژنەی زاراوە لە کۆڕی زانیاری کوردستان، هەولێر، چـاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٠٨ لاپەڕە).
١٣) فەرهـەنگی زاراوەگـەلی ڕاگەیانـدن (ئینگلیـزی ـ کـوردی ـ عـەرەبی)، بـەدران ئەحمـەد حـەبیب، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، سـاڵی ٢٠٠٥، (١٦٥ لاپەڕە).
١٤) ئەدەبی منداڵانی کورد ـ لێکۆڵینەوە ـ مێژووی سەرهەڵدان، حەمە کەریم هەورامی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٤٠٦ لاپەڕە).
١٥) گیرەکێن زمانێ کوردی، د. فـازل عمـر، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٣٤ لاپەڕە).
١٦) ل دۆر ئەدەبێ کرمانجی ل سەد ساڵا نـوزدێ و بیـستێ زایـینی، تەحـسین ئیـبراهیم دۆسکی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٧٦ لاپەڕە).
١٧) دەنگسازی و بڕگەسازی لە زمانی کوردیدا، د. شـێرکۆ بابـان، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (٢٠٦ لاپەڕە).
١٨) هۆنراوەی بەرگری لەبەرهەمی چەند شـاعیرێکی کرمـانجی سـەروودا ١٩٣٩ ـ ١٩٧٠، د. عبدالله یاسین عەلی ئامێدی، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، سـاڵی ٢٠٠٥، (٣٢٠ لاپەڕە).
١٩) یوسف و زولەیخا، حـەکیم مـەلا سـاڵح، هـەولێر، چـاپخانەی وەزارەتـی پـەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٧ لاپەڕە).

٢٠) زمانی كوردان ـ چەند لێكۆڵینەوەیەكی فیلۆلۆجی زمان، پ. د فریدریش موولێر ئەوانی تر، و: لە ئەڵمانییەوە د. حمید عزیز ، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٥، (١٩٢ لاپەڕە ).
٢١) ڕێبەری بیبلۆگرافیە كوردییەكان ١٩٣٧ ـ ٢٠٠٥، شوان سلێمان یابە، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٤٠٠ لاپەڕە).
٢٢) فەرهەنگی گەورەی من. د. كوردستان موكریانی، چاپی یەكەم، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦ ، (٨٠ لاپەڕە).
٢٣) دیوانی عەزیز ـ محەمەد عەلی قەرەداغی ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠، (١٤٤ لاپەڕە).
٢٤) زاراوەگەلی كاروباری مین ـ جەمال جەلال حوسێن ـ دلێر سابیر ئیبراهیم ـ دەزگای گشتی هەرێم بۆ كاروباری مین، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٨٠ لاپەڕە).
٢٥) زاراوەی ڕاگەیاندن ـ كەمال غەمبار ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٩٦ لاپەڕە).
٢٦) زاراوەی ئەدەبی ـ ئامادەكردنی: لیژنەی ئەدەب لە كۆڕی زانیاری كوردستان، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٣٨٠ لاپەڕە).
٢٧) ئیندێكسی گۆڤاری كۆڕی زانیاری كورد (١٩٧٣ ـ ٢٠٠٢) ـ شوان سلێمان یابە ـ هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (٢٤٠ لاپەڕە).
٢٨) The Historical Roots of the National Name of the Kurds ـ د. جەمال رەشید، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ساڵی ٢٠٠٦، (١٠٧ لاپەڕە)
٢٩) فەرهەنگی كۆمەڵناسی ـ عوبێد خدر ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٨٣ لاپەڕە).
٣٠) بزاڤی ڕزگاریخوازی نیشتیمانی لە كوردستانی ڕۆژهەڵاتدا (١٨٨٠ ـ ١٩٣٩ز) ـ د. سەعدی عوسمان هەروتی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٥٥ لاپەڕە ).
٣١) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا ، نووسینی: حەسەن عەلی خانی گەڕووسی ، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ٢٠٤ لاپەڕە ).

٣٢) شۆڕشــی شــێخ عوبەیــدوڵڵای نــەهری لــە بەڵگەنامــەی ئەرمەنیــدا، نووســینی: ئەسکەندەر غوریانس، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ١٢٨ لاپەڕە ).

٣٣) فەرهەنگی کوردی ـ فارسی، وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١١٢ لاپەڕە ).

٣٤) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلای نەهری لە بەڵگەنامەی ئینگلیزی و ئەمریکی دا ـ نووسینی ـ وەدیع جوەیدە. وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە ـ محەمەد حەمە باقی . چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، ( ١١٦ لاپەڕە ).

٣٥) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا، نووسینی: عەلی خان گۆنەخان ئەفشار. وەرگێڕانی لە فارسییەوە ـ محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٤٢٦ لاپەڕە ).

٣٦) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەی قاجاری دا، نووسینی: عەلی ئەکبەر سەرهەنگ. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧. (١٩٢ لاپەڕە).

٣٧) چەپکێك لە زاراوە گەلی کشتوکاڵ ـ ئامادەکردنی ـ حەمە ساڵح فەرهادی ـ چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٤٤ لاپەڕە).

٣٨) شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری لە بەڵگەنامەکانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی ئێران دا. وەرگێڕانی لە فارسییەوە: محەمەد حەمە باقی. چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٢٧٠ لاپەڕە)

٣٩) فەرهەنگی دیوانی شاعیران (نالی، سالم، کوردی)، نووسینی ـ د. محەمەد نووری عارف، چاپخانەی دەزگای ئاراس ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (١٠٠٠ لاپەڕە).

٤٠) یەکەم فەرهەنگی تۆ، وەرگێڕانی: د.کوردستان موکریانی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٨٦ لاپەڕە).

٤١) ئەدەبی منداڵانی کورد دوای ڕاپەڕین، نووسینی: حەمە کەریم هەورامی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٣٦٨ لاپەڕە).

٤٢) فەرهەنگی هەراشان، کۆکردنەوە و داڕشتنی: کۆمەڵێك مامۆستا، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠٠٧، (٣٣٦ لاپەڕە).

**ئەكادیمیای كوردی:**


٤٣) ئەلبوومی كەشكۆڵ، ب ١، دانراوی: محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٥٢ لاپەڕە).

٤٤) الأدب الشفاهي الكردي ، علي الجزيري ، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٢٠٠ لاپەڕە).

٤٥) بەركوڵێكی زاراوە سازیی كوردی، ئامادەكردنی: جەمال عەبدول، دووەم چاپ، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٣٠ لاپەڕە).

٤٦) دیوانی قاصد، ساغكردنەوەی: شوكر مستەفا و رەحیم سورخی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٥٢ لاپەڕە ).

٤٧) چەند لێكۆڵینەوەیەك دەربارەی مێژووی كورد لە سەدەكانی ناوەڕاستدا، نووسینی: دكتۆر زرار سدیق تۆفیق، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٢٠٨ لاپەڕە).

٤٨) كیمیای ژەهری دەستكرد. نووسینی: پ.د. عەزیز ئەحمەد ئەمین، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٢٠٨ لاپەڕە).

٤٩) ڕۆڵی سەربازیی كورد لە دەوڵەت و میرنشینە ناكوردیەكان لە سەردەمی عەبباسیدا، نووسینی: مەهدی عوسمان حسێن هەروتی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٦٨ لاپەڕە).

٥٠) دور نواب السليمانية في المجلس النيابي العراقي (١٩٤٥ - ١٩٥٨)، دانانی: سالار عبدالكريم فندى الدوسكی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٠٤ لاپەڕە).

٥١) عبدالله گۆران، رائداً لحركة تجديد الشعر الكوردي، دانانی: كەمال غەمبار چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٣٢٠ لاپەڕە).

٥٢) وثائق بريطانية عن تشكيل دولة كوردية مستقلة ١٩٢٤ - ١٩٢٧ ، دانانی: د. عبدالفتاح على البوتانی، چاپخانەی خانی - دهۆك، ساڵی ٢٠٠٨، (٢٦٨ لاپەڕە).

٥٣) ساڵنامەی ئەكادیمیای كوردی ، ئامادەكردنی: پرۆفیسور د. وریا عومەر ئەمین . چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٥٦ لاپەڕە).

٥٤) مەمێ و زینێ، ئامادەكردنی: جاسمێ جەلیل، دوكتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ خستوویەتییە سەر نووسینی كوردیی عیراق و پێشەكیی بۆ نووسیوە و لێی كۆڵیوەتەوە، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٨ لاپەڕە).

٥٥) هەنگاوێك لەسەر ڕێگەی لێكۆڵینەوەی (دیوانی سالم)دا، محەمەدعەلی قەرەداغی، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٨٠ لاپەڕە).

٥٦) کەرەسە بەتاڵەکان لە روانگەی تیۆری دەسەڵات و بەستنەوە ((شێوەزاری کرمانجی سەروو))، نووسینی: ڤیان سلێمان حاجی، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢١١ لاپەڕە).
٥٧) هێز و ئاواز لە دیالێکتی کوردیی ژووروودا، نوسینی: عەبدولوەهاب خالید موسا، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، سالی ٢٠٠٩، (١٤٦ لاپەڕە).
٥٨) گەپنامەی مێرگولآن، نوسینی: رەسولّ دەروێش، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، ( ١٧٦لاپەڕە).
٥٩) دۆخەکانی ژێرەوە لای فیلمۆرو هەندی لایەنی ڕستەسازیی کوردی، ئامادەکردنی: یوسف شەریف سەعید، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (١٣٤ لاپەڕە).
٦٠) هەندێ لایەنی ڕێزمانی دەسەڵات و بەستنەوە (GB) لەزمانی کوردیدا، ئامادەکردنی: د.سەباح ڕەشید قادر، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (١٧٢ لاپەڕە).
٦١) الحیاة الاجتماعیة للکورد بین القرنین (٤ - ٩هـ/١٠ - ١٥م)، دانانی: دکتۆرە فائزە محەمەد عزەت، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢٧٢ لاپەڕە).
٦٢) العلاقات الایرانیة - السوفیتیة ١٩٣٩ - ١٩٤٧، دانانی: نزار ایوب حسن الگولی، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٢٩٠ لاپەڕە).
٦٣) بیبلیۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە فەرەنسییەکاندا، د. نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٥٢٨).
٦٤) بیبلیۆگرافیای کوردناسی لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا، د. نەجاتی عەبدوڵڵا، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٤٤٨).
٦٥) امیر امراء کردستان (ابراهیم باشا الملی ١٨٤٥ - ١٩٠٨)، دانانی: أ. د. عبدالفتاح علی البوتانی - علی صالح المیرانی، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٠ لاپەڕە).
٦٦) دیوانا مەلا محەمەدێ سەیدا، بەهەڤکار: سەید جەلال نزامی، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٨٨ لاپەڕە).
٦٧) داستانی هەیاسی خاس و سوڵتان مەحموود، نووسینی: محەمەد ساڵح سەعید، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (٣٢٦ لاپەڕە).

٦٨) کیمیای ژینگـه، پیـسبوونی ئاووهـەوا، پ . د. عـەزیز ئەحمـەد ئـەمین، چـاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٦٠ لاپەڕە).
٦٩) گەشتنامەی پوژولا بۆ کوردستان ساڵی ١٨٣٧، وەرگێڕانـی: د. نـەجاتی عەبـدوڵڵا، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٩٨ لاپەڕە).
٧٠) ڕێزمـانی کـوردی، وەرگێڕانـی: د. نـەجاتی عەبـدوڵڵا، چـاپخانەی حـاجی هاشـم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩، (١٤٤ لاپەرە).
٧١) بونیـاتی زمـان لەشـیعری هاوچـەرخی کوردیـدا، ئامـادەکردنی: د. ئـازاد ئەحمـەد مەحموود، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠٠٩ (٢٥٨ لاپەڕە).
٧٢) الحرکـە الـشیوعیە فی تقـاریر مدیریــە الامــن العامــە ١٩٥٩ ـ ١٩٦٢، نووســینی: د. عبـدالفتاح علـی البوتـانی، چـاپخانەی حـاجی هاشـم ـ هـەولێر، سـاڵی ٢٠٠٩، (٢٨٨ لاپەڕە).
٧٣) فەرهەنگی سۆفیانەی دیوانی (جزیری و مەحوی)، نووسینی: د. ئیـبراهیم ئەحمـەد شوان، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٣٦٠ لاپەڕەیە).
٧٤) چیرۆکی منداڵان لە ئەدەبی کوردیدا (١٩٩١ ـ ٢٠٠٥)، دانانی: ڕازاو ڕەشید صەبری، چاپخانەی حاجی هاشم ـ هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٢١٢ لاپەڕە)
**٧٥)** هەولێر لە سەردەمی ئەتابەگیاندا، نووسینی: پ. د. موحسین موحەممـەد حوسـێن، عثمان علی قادر کردویـە بـە کـوردی، چـاپخانەی حـاجی هاشـم ـ هـەولێر، سـاڵی ٢٠١٠، (٤٧٣ لاپەڕە).
٧٦) هـەورامان باشـتر بناسـین، نووسـینی: موحەممـەد رەشـیدی ئـەمینی، چـاپخانەی حاجی هاشم هەولێر، ساڵی ٢٠١٠، (٩٦ لاپەڕە).